# چارەسەری

# کێشەی کورد

# لەنێوان ئیمان و پەرلەمان دا

نووسینی
عەلی باپیر

١٤١٢ك-١٩٩٢ز

# پێشکەش بێ

١ـ بە گەلی کوردی موسڵمان کە بەیارمەتی خواو هیممەتی مـــــەردان
بەسەلامەتی لەم واقیعە سەختو دژوارە ڕزگاری دەبێو، ئیسلامیانە
خۆی نوێ دەکاتەوەو یەکجاری لەخەم دەڕەخسێ .

٢ـ بەو موسڵمانانەی کە ئەوەندە لە ئاینەکەیان تێگەیشتـــوون
سنووری نێوان کوفرو ئیمانیان لێ تێکەڵ نەبێو، گومانیـــــان
وانەبێ کە ( بە شایەتمان هێنان کاریان تەواوەو دوایی هەرچـــی
دەبێ با ببێ ) !!

٣ـ بەو ئیسلامیانەی کە هێندە لە بەرنامەکەیان دا شارەزاو ڕۆچوون
فریوی درووشمی بۆشو بریقەدار نەخۆن و، دیواری کاریان لەســەر
بناغەی غەیری ئیسلام بنیات نەنێن و، بەڕێ ی خۆیان دا نەـــــێ
نەڕۆن !!

# پێشەکی

سوپاس و ستایشێک بۆخوا کە هەر لایقی خۆیەتی، وە ڕەحمەت و مەدح و سەنا لەو زاتە بەرزو مەزن و بێ وێنەیەوە وەک ڕێژنە بارانی بەهار دابارێ بەسەر گیانی بەرزو بیرۆزی تێکڕای پێغەمبەران دا بەگشتیو بەتایبەتی گەورەو سەروەریان موحەممەدو عزمو هاوەڵ و شوێن کەوتووانی ڕەسەنی .

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم !

ئەمڕۆ گەلەکەمان بە ناسکترین و دژوارترین قۆناغەکانی ژیانیدا ڕەت دەبێ، بەڵێ ئەمڕۆ گەلی کورد وێڕای گەلانی دیکەی برای لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامدا لە گەرمەی ژان ( مخاض ) ی لەدایکبوونێکی نوێ دایە ! چونکە بەڕاستی هەروەک چۆن ژیانی ئینسان لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە لە دنیای تەنگ و تاریکی منداڵدان ڕزگاری دەبێو چاو بەدنیای ڕوون و فراوان هەڵدێنێ ، ژیانی ڕاستەقینەی گەلانیش لەو ڕۆژەوە دەست پێ دەکات کە لە زیندانی کۆیلەیی‌و ژێردەستەیی قوتاریان دەبێو چاو بە دنیای گەش و ڕوونی ئازادی و سەربەستی‌و سەربەخۆیی هەڵدێنن .

جا ئەوە کە ئایا گەلی کوردو هەموو ئەو گەلانەش کە خوای پەروەردگار ماوەی چواردە سەدەیە لە نیعمەتی هەرە بەرزی ئیمان و ئیسلام بەهرەمەندی کردوون . ئیسلامییانە لەدایک دەبن و کیان و قەوارەیەکی شەرعییانەی ڕەسەن لەسەر بنچینەی ( ئیمان ) بۆخۆیان بنیات دەنێن . تاکو ناوو نیوەڕۆکیان یەک بێ !

یان ـ خوانەخواستە ـ بەپێچەوانەوە هەویەو حەقیقەتی ڕەسەنی

خۆیان دەدۆڕێنن و، بە فێڵ و تەڵەکەی جۆراوجۆری ناحەزانیان فریودەخۆن و لە ڕاستەڕێ لادەدرێن ، بەڵێ ئا ئەوەی گوتمان هەتا بڵێی ئەرکێکی بەرزو پیرۆزو گرانە لەسەر شانی ئەو گەلە موسڵمانە بەگشتی و پێشەوا و چاوساغە ئیسلامییەکان بەتایبەتی .

ئیدی بەئومێدی ئەوەی کە ئێمەش و هەموو گەلانی دیکەی موسڵمانیش بتوانین لەدایک بوون و نوێ بوونەوەیەکی ئیسلامیانە بۆخۆمان هەڵبژێرین و، دەرفەت بەپیلان و فرووفێڵی ناحەزانمان نەدەین کە نە ( لەبار ببرێین ) نە ( بخەڵەتێنرێین ) !!

پەروەردگاری میهرەبان و دادگەریشمان فەرموویەتی :

( والذینَ جاهدوا فِینا لَنَهْدِیَنَّهُم سُبُلَنا وان اللهَ لَمَعَ المُحسنین )

٢٥ شوال ١٤١٢ ك

٢٧ نیسان ١٩٩٢ ز

ڕانیە / بەشە كوردستانی سەربەعێراق

# ڕێ خۆشکردن

# کێشەی کورد بەشێکە لە کێشەی ئوممەتی ئیسلامی

دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی کە دوایین قەڵاو سێبەری ئوممەتی ئیسلام بوو، بەهۆی چەند ناتەواوی و ناڕێکییەکی زاتیو پیلان و فێڵی دەرەکییەوە نەخۆش بوو و وردە وردە کزو لاواز بوو و بنێشا، دوژمن و ناحەزانی داخ لەدڵی ئەو ئوممەتە لەهەموو لاوە وەک.... گورگی هار زاریان لێ داپچڕی و پەلاماریان دا، هەتا سەرەنجام لەسەر دەستی بەکرێ گیراوی ئیمپریالیزمی جیهانی کەمال ئەتاتورک لە ساڵی (١٩٢٤)دا دوا هەناسەی تەمەنی حوکمی سێزدە سەدەو نیوی ئیسلام ڕاگەیەنراو چەق ( مرکز ) ی خەلافەتی ئیسلامیش کە تورکیایە بوو بە دەوڵەتێکی بێ دینانەی سەر بە ڕۆژئاوا !

بەڵێ دوای ئەوە جیهانی پان و بەرینی ئیسلام لەسەر سفرەو خوانی ئیمپریالیزمی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وەک گۆشتی خێرێ . یان نێچیری بەر کەڵبەی چەند دڕندەیەک ، وەک ئێستا دەیبینین کوت کوت کراو لەنێو زلهێزەکان دا بەشرایەوەو، ئوممەتی ئیسلامیش وەک مەڕی بێ شوان لەیەک پەڕیدەو پەرتەوازە بوون و لێک نامۆ بوون !

بەڵام خوا هەقە بەشکی گەلی کورد لەو بەش بەشکران و لێک دابڕانە لە ی هەموو گەلانی دیکەی موسڵمان زیاتر بوو، ڕەنگە هۆی ئەمەش ئەوە بووبێ کە ڕق و قینی ئیمپریالیزم سەبارەت بە ڕۆڵەکانی صەلاحەددین لە ڕق و قینیان سەبارەت بە هەموو گەلانی دیکە زیاترەو، دیارە سزاو تۆڵەش لەقەدەر تاوانە !

بەڵێ هاوکات لەگەڵ کەل وپاچ کرانی نیشتمانی ئیسلامی نیشتمانی کوردیش کرا بە پێنج کوتەوەو هەر کوتەش لکێنرا بە یەکێک لەو دەوڵەتانەوە کە لەگەڵ نیشتمانی کورددا دراوسێن ( تورکیاو ئێران و عیراق و سووریاو ڕووسیا ) .

کەواتە ڕاستە کە کێشەی کورد بەشێکە لە کێشەی ئۆممەتی ئیسلام و چەوساوەیی ئەو گەلە ستەمدیدەیە برینێکی قووڵ و بیرەزایە لە جەستەی ئۆممەتی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم، بەڵام بەداخەوە کە لەسۆنگەی کەمبوونەوەی هەست و نەستی برایەتی ئیسلامی لەنێو موسڵمانان دا ئەو گەلە نەبەزە ماوەیەکی دوورو درێژە بەتەنیا ئازارو ئێش و ئەشکەنجەی ئەو زام و برینە دەکێشێ و کەس خۆی لێ وەئاگا ناهێنێ! (١)

جا خوێنەری بەڕێز ئەم نووسراوەی بەردەستت لە هەشت بەشان پێکهاتوە، بەم شێوەیەی خوارێ :

بەشی یەکەم: ئاوڕدانەوەیەک بۆ ڕابردوو کە ئەم سێ مەسەلە گرنگەی تێدا توێژراونەوە : ١- ( دەردی چەوسێنرانەوەی "کورد "

---

(١) سوپاس بۆخوا لەم ساڵانەی دواییدا وردە وردە خەریکە کۆمەڵ و بزووتنەوەو کەسایەتییە ئیسلامییەکان ئەو لەکەو پەڵە ناشیرینە لەخۆیان دەکەنەوەو ، لە گۆڤارو ڕۆژنامە ئیسلامییەکان دا دەست کراوە بە باسکردن و لێکۆڵینەوە دەربارەی مەسەلەی کوردو چارەسەری ئەو کێشەیە لەڕوانگەی ئیسلامەوە ، پێم وایە چاکترین بەرهەمیش تا ئێستا کە لەو بارەوە نووسرابێ کتێبە دڵبزوێنەکەی خوالێخۆشبوو ( فهمي الشناوي ) یە بەناوی : ( الاكراد : يتامى المسلمين ) .

هەروەها هەرکام لە ( صلاح شادي ) خوالێخۆشبوو و دکتۆر ( عمر عبدالرحمن ) موفتی ( الجماعة الاسلامية ) ی میسرو ( فهمي هويدي ) ، شتی باشیان لەوبارەوە نووسیوە .

وەک نەتەوەیەکی کەی و لەکوێوە سەری هەڵدا ؟! )

٢- ( چاوپێداخشاندنێکی شۆڕش و ڕاپەڕینە ڕزگاریخوازەکانی کورد ).

٣- ( گەورەترین هۆی بێ ئاکامی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کورد ) .

بەشی دووەم : گەلی کورد چی دەوێ ؟!

بەشی سێیەم : لەڕێی دیموکراسی و پەرلەمانەوە دەگەینە چی ؟!

بەشی چوارەم : دیموکراسی لە تەرازووی ئیسلام دا .

بەشی پێنجەم : ئیمان چارەی دەردی کورد دەکات نەک پەرلەمان .

بەشی شەشەم : ئایا بێجگە لەم ڕێیە چارەیەکی ترمان هەیە ؟!

بەشی حەوتەم : لەکوێ وەو چۆن دەست پێ بکەین ؟!

بەشی هەشتەم : سەرەنجامی سۆگەر .

# بەشی یەکەم
## ئاوڕدانەوەیەک بۆ ڕابردوو

خوێنەری خۆشەویست !

بەپێویستی دەزانم ئاوڕێک لە مێژووی ڕابردووی گەلەکەمان بدەینەوەو لەو ئاوڕدانەوەیەشدا سێ مەسەلەی گرنگ بکەینە جێی سەرنج و ڕامان و بیان توێژینەوە ، کە ئەمانەن :

یەکەم : دەردی چەوسێنرانەوەی " کورد " وەک نەتەوەیەک کەی و لەکوێ وە سەری هەڵدا ؟

کەسانێک کە شارەزاییان لە مێژووی ئیسلامیدا نیە یان کاڵ و کرچەو زۆر جاریش هەر لەپشت پەردەی ڕەشی ناحەزانی ئیسلامەوە سەرنجی مێژووی ئیسلامی دەدەن ، ئەمە لەسەرێکەوەو لەسەرێکی دیکەشەوە کەوتوونە ژێر تەئسیری سەلبیی واقیعیی ئەو ڕژێم و دەوڵەتانەی کە دان بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورددا نایەنن و زۆر دڕندانەش ئەو شۆڕش و جموجۆڵە ڕزگاریخوازانە سەرکوت دەکەن کە داوای ئەو هەقە شەرعیو ڕەوایانە دەکەن بۆ گەلەکەیان ، وا گومان دەبەن کە دەردی گۆڕین ڕووەکێکی ژەهراوی بەو لە زەوی ئیسلامدا ڕوواوەو گووراوە ! بۆ سەلماندنی ڕاستیی ئەو گومانەشیان چەند وێنەو دیمەنێک لە مێژووی سەردەمی ئەمەوی و عەبباسی و عوسمانییەکان بە بەڵگە دێننەوەو گەلێک جاریش بەسەرهاتی مەلای خەتێ لەگەڵ میری گۆرە دەکەنە سەرباری ئەو بەڵگانە !! (١)

---

(١) لە کتێبی ( سۆزی نەتەوایەتی ) دا وەڵامی ئەو جۆرە تۆمەتانە دراوەتەوە ، بەتایبەتی بەسەرهاتی میری کۆرەو مەلای خەتێ .

هەڵبەتە ئێمە نکووڵی لەوە ناکەین کە لەسۆنگەی ئــــەوەوە زۆربەی هەرە زۆری کاربەدەستانی دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامــــی چ لەسەردەمی ئەمەوی و عەبباسییەکان و چ لەسەردەمی عوسمانی یــە ـ کانیشدا وەک پێویست پابەندو مل کەچی یاساکانی ئیســـلام نەبوو ون ، کەم و زۆر رەعیەت و دانیشتووانی ژێر سایەی ئــــەو دەوڵەتە تووشی ستەم و زۆرو چەوسانەوە بوو ون ، بەڵام یەکەم:بەشی کورد لەو بارەوە ئەگەر کەمتر نەبووبێ قەت زیاتر نەبووە، دووەم هیچ کاتێک گەلی کورد ـ و هیچ نەتەوەیەکی دیکەش ـ وەک ... نەتەوەیەک و لەبەر خاتری کورد بوون لەژێر سایەی حوکمی ئیسلامیدا دووچاری ستەم و بێ دادی نەبووە .

دیارە هەر بۆیەش من سەرباسەکەم ئاوا نووسیوە :( دەردی چەوسێنرانەوەی کورد وەک نەتەوەیەک کەی و لەکوێ وە سەری هەڵدا ؟) چونکە وەکگوتمان ئێمە ئینکاری ئەوە ناکەین کە کوردیــــش هاوڕێ لەگەڵ گەلانی دیکەی ئیسلامدا وەک رەعیەت و دانیشتووانـــی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی لەکاتی لادان و کەمتەرخەمــــی کاربەدەستانیدا گیرۆدەی زەبرو زەنگ و بێ دادی بووە ، ئنجـــا لەو بارەشەوە ئەگەر بەشی کورد لە ئی گەلانی دیکە کەمتر نەبووبێ زیاتریش نەبووەو یەکسان و وەک یەک بوو ون ، وە ئەوەش کـــە واقیعی ژیانی گەلی کوردی وا تاڵ و دژوار کردوەو ناچاری کردوەو پەنای بێ بردۆتە بەر زنجیرە شۆڕش و ڕاپەڕینێکی نەپساوە لـــە هەموو پارچەکانی کوردستاندا ئەوە بووە کە ئەو گەلـــە وەک نەتەوەیەک دووچاری ستەم و ماف پێشێل کران و قەڵاچۆکران بووە :

نەخێر چەوسێنرانەوەی کورد بەو شێوەیەی گوتمان لـــە زەوی ئیسلامدا نەڕوواوەو ناشتوانێ بڕوێ ، بەڵکو وەک لە پێشـــەوەدا بەکورتی خستمانەڕوو، وە لە کتێبی ( سۆزی نەتەوایەتی ) دا لـــە

چەند شوێنێکدا بەدرێژی باسمان کردوە دەردو مەینەتی و چەوسێنرانەوەی ( کورد ) و غەیری کوردیش لە جیهانی ئیسلامی دا لەو کاتەوە سەری هەڵدا کە ئیمپریالیزمی جیهانخۆری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا پاش نەمانی دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی توانی دەست بەسەر جیهانی ئیسلامی‌دا بگرێ و بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو لەنێوخۆی دا دابەشی بکات

بەڵێ ئەوەبوو کە لە نێوەڕاستی جەنگی جیهانی یەکەم دا لە ساڵی (١٩١٦ ) ی زایینی‌دا زلهێزەکان بەپێی پەیمانی شوومی ( سایکس‌بیکۆ ) " کوردستان " یان بەم شێوەیەی ئێستای دابەش کردو ، ئیدی لەدوای ئەو پەیمانە بێ فەڕو نەگبەتەوە کە لە دڵ و مێشکی پڕ بوغزو کین و فێڵ و تەڵەکەی ئیمپریالیزم‌دا گوورا بوو بڕیاردرا کە وشەی ( کوردستان ) لەسەر نەخشەی سیاسی جیهان نەمێنێ‌و ، گەلی کوردیش وەک نەتەوەیەکی خاوەن نیشتمان و زمان و کیان هیچ حیسابێکی بۆ نەکرێ ، جا بێگومان هەر کەسێکیش لەمە چاکترو زیاتر لە ئیمپریالیزم‌و جیهانخۆران چاوەڕێ بکات پێویستە چاوێکی ورد بە بیرو لێکدانەوەی خۆی و مێژوو و واقیعی ئەو دەوڵەتە ڕۆژهەڵاتی‌و ڕۆژئاواییانەدا بگێڕێتەوە کە لە زەوی بێ خێری بیری ماددییەت و بێ‌دینی‌دا ڕسقاون و بە ئاوی بیری بیردۆزەکانی داروین و مارکس‌و نیتشەو فرۆید ئاودراون !!

دووەم : چاوپێداخشاندنێکی شۆڕش‌و ڕاپەڕینە ڕزگاریخوازەکانی کورد

بەرگری ( دفاع ) لەخۆکردن و بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ هەر مەترسییەکدا کە هەڕەشە لە بوون ( وجود ) دەکات ، یاسایەکی بنچینەیی‌و سروشتییە کە خودا ـ جل جلالە ـ لە جیهانی گیانداران دا دایناوە بۆئەوەی بتوانن درێژە بە بوونی خۆیان بدەن ، هەر بۆیەش

دوای ئەوەی نیشتمانی کورد لە سەرەتای سەدەی شازدەیەمی زاینییەوە لەدەوری (١٥١٤) دا پاشئەوەی (چالدێران) کە لەنێوان سولتان سەلیمی عوسمانیو شا ئیسماعیلی سەفەوی دا ڕووی دا ، بوو بە دوو بەش ، بەشی ڕۆژهەلاتی کەوتە جوغزی دەولەتی سەفەوی یەوەو بەشی ڕۆژئاواشی هەر لەژێر ڕکێفی دەولەتی عوسمانیدا مایەوە ، وەک زۆربەی جیهانی ئیسلامی ئەوکاتە ، بەلێ جا هەر لەدوای ئەو ڕووداوەوە گەلی کورد بەپێی ئەو باسە سروشتییەی گوتمان لە بیرو هەولی ئەوەدا بووە کە هەردووک بەشە لێکدابراوەکەی نیشتمانی بخاتەوە سەریەک و لەیەک قەوارەو بوون دا خۆی ببینێتەوە ، کاریگەرترین هەول و هەنگاویش بۆو مەبەستە ڕاپەڕینە مەزنەکەی شێخ عوبەیدوللای نەهری بوو کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا لە بەشە کوردستانی سەر بە تورکیای ئێستادا سەری هەلداو بەشێکیشی لە بەشە کوردستانی سەر بە ئێران گرتەوە ، بەلام بە هاوکاری سێ قولیانەی دەولەتی عوسمانیو ئێران و ڕووسیای قەیسەری خاموشکرایەوەو شێخیش بۆ حیجاز دوورخرایەوە .

بەلام پاشدابەشکرانی کوردستان بەشێوەیەکی ڕەسمی لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکان ( حلفاء ) ەوە لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدا ، وەک پێشتر باسکرا لە هەموو پارچەکانی کوردستانی بەرین دا دەستکرا بە جموجول و ڕاپەڕینی پەیتا پەیتاو بێ پسانەوە ، کە دیارە ئێمە لەم لێکولینەوە کورتو خێرایەدا کە هەروەک ڕێ خۆشکردن و پێشەکی ئەم باسانە دێنینە پێش ، دەرفەتی ئەوەمان نیە کە نەکهەر بە تێروتەسەلی بەلکو بەکورتیشیاسیان لێوە بکەین ، بۆیە ناچارین وەکلە ( سەرباس ) ەکەدا گوتوومانە بە چاوپێداخشاندنێک وازبێنین هەتا دەرفەتێکی دیکە کە لە

شوێنێکی تایبەت و تەرخان دا ئەو مەسەلەیە بتوێژینەوە .

سەرەتا ڕاستەوخۆ دوای جەنگی جیهانی یەکەم هەرکام لە شێخ مەحموودی حەفیدو سمایلاغای شکاک ( سمکۆ ) ، یەکەمیان لە کوردستانی خوارو و دووەمیان لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دەستیان بە جموجۆڵ و دژایەتی کردنی ئەو ڕژێمانە کرد کە کوردیان دەچەوساندەوەو داوای مافی ڕەواو شەرعیی گەلەکەیانیان کرد کە بریتیە لە ئازادی و سەربەخۆیی ، بەڵام هیچ کامیان بە ئەنجام نەگەیشتن و سەرەنجام یەکەمیان ئینگلیزە فێڵبازو دووڕووەکان خیانەتیان پێکردو مەلیکایەتییەکەی سەری لە دوورخرانەوە ( تبعید ) ەوە ـ بۆ هیندستان ـ دەرچوو ! دووەمیشیان بە فرو فێڵ و درۆو دەلەسە کەوتە بۆسەوەو کوژرا .

ئنجا لە ساڵی ( ١٩٢٥) دا شێخ سەعیدی پیران لە بەشە کوردستانی سەر بە تورکیادا ڕاپەڕی و توانی چەند شارو ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی سەر بە تورکیا ئازاد بکات ، بەڵام ئەویش سەرەنجام شکستی هێناو تورکە ڕەگەزپەرستەکان لە سێدارەیان دا ، لە سییەکانیشدا هەرکام لە ( شێخ عبدالسلام ) ی بارزانیو ( شێخ احمد ) ی برای و ( ملا مصطفى ) ی برا گچکەیان زنجیرە جموجۆڵ و ڕاپەڕینێکیان لە ناوچەی بادینانی بەشە کوردستانی سەر بە عێراقدا ساز کرد ، بەڵام ئاکامێکی ئەوتۆیان نەبوو ، هەرچەندە هەرکام لەم جموجۆڵ و ڕاپەڕینانەو ئەوانەی دوای ئەوانیش تەئسیرێکی گرنگیان هەبوو ، هەم بۆسەر گەلی کورد لەبواری بێداری و هوشیارکردنەوەو هاندانیدا و ، هەم بۆسەر ڕژێمە ستەمکارو داگیرکەرەکان کە هەتا ڕاددەیەک دەست لە هەندێک ستەم و دەستدرێژی بگرنەوەو بیرێکی جیددی تر لە چارەنووسی ئەو گەلە خواناسەو بەجەرگە ستەم لێکراوە بکەنەوە .

هەڵبەتە هەر لەو ماوەیەدا ـ واتە لە سییەکاندا ـ هەم لە

کوردستانی سەر بە تورکیا و هەم لە سووریا شۆڕش و جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد درێژەی هەبوو ، بەڵام هەموو جارێ ئەو ڕژێم و دەوڵەتانە کە کوردیان بەسەردا بەشرابۆوە لە بەرانبەر ڕاپەڕینەکانی کورددا پێکەوە ڕیزیان دەبەست و هاوکاری یان دەکرد بۆ داپڵۆسین و سەرکوت کردنیان .

پاشان لە ساڵی ( ١٩٤٥ ) دا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە شاری ( مهاباد ) دامەزراو ،[1] لە ڕۆژی(٢)ی ڕێبەندانی ساڵی ( ١٩٤٦) یش لە مەیدانی چوارچرای شاری مهاباددا ( کۆماری کوردستان ) دامەزراو ( قازی محمد ) بە یەکەمین و دوامین سەرۆک کۆمار هەڵبژێررا .[2] بەڵام حەیفێ ئەم کۆمارەی قازیش وەک مەلیکایەتی یەکەی شێخ مەحموود زۆر کەم تەمەن بوو و ساڵێکی نەخایاند کە ڕژێمی ڕەزا شای ئێران پاش کەبین و بەین کردن لەگەڵ ( ستالین ) ی دیکتاتۆری یەکیەتی سۆفیەت ، توانی هەردووک کۆمارەکەی ( ئازەربایجان ) و ( کوردستان ) کۆتایی پێ بهێنێ ، کە لەسەر گفت و بەڵێنی ڕژێمی ( سۆشیالیزمی عیلمی ) یەکیەتی سۆفیەت بنیات نرابوون !!

هەروەها لە ساڵی ( ١٩٤٦ ) یشدا لە بەشە کوردستانی سەر بە عێراق پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق دامەزرا ،[3] کە پاش چوونی ( مەلا مصطفى ) ی بارزانی بۆ ڕووسیا و گەڕانەوەی لە ساڵی

---

(١) بڕوانە ( چل ساڵ خەبات لە پێناوی ئازادی ) بەرگی یەکەم لاپەڕە (٣٢) نووسینی : عبدالرحمن قاسملو / چاپی دووەم

٢- سەرچاوەی پێشوو / لاپەڕە ( ٦٧ ، ٦٨ )

٣- بۆیە باسی ( حیزبی شیوعی عیراقی ) م نەکرد کە گوایە لە ساڵی ( ١٩٣٤ ) ەوە دامەزراوە ، چونکە خەباتی ئەوان تایبەت نیە بە کوردستانەوە ، وە لەو سەرو بەندەشدا باسی کورد کردن و کوردایەتی - یان پێ کۆنەپەرستی و بەجیهانی ی بووە !!

(١٩٥٨)دا دوای شۆڕشی (١٤) ی تەمموز ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا . وە لە ساڵی (١٩٦١)دا حیزبی ناوبراو بە سەرکردایەتی ( ملا مصطفى ) گەورەترین شۆڕشی دژی ڕژێمە یەک لەدوا یەکەکانی عێراق بەرپاکرد کە بە شۆڕشی ئەیلوول ناسراوەو هەتا ساڵی (١٩٧٥) کە بە ساڵی ( هەرەس) یان ( ئاشبەتاڵ ) بەناوبانگە دەوامی کرد . بەڵام لەڕووی ئاکام و ئەنجامەوە بەمەرەدی پێشووەکانی چوو .

پاشان وێڕای بەردەوام بوونی ئەو دوو حیزبەی باسمان کردن چەند کۆمەڵ و تاقمێکی دیکەش بەتایبەتی لەکۆتایی حەفتاکان دا لە زۆربەی پارچەکانی کوردستان دا سەریان هەڵدا کە ئەمانە دیارترینیانن : کۆمەڵەی ڕەنجدەران ، شۆڕشگێڕان .. لە کوردستانی سەربەعێراق دا کە پاشان ( یەکێتی نیشتمانی ) یان لێ پێکهات ، هەروەها حیزبی سۆشیالیستی کوردستان هەر لەوێ ، وە لە کوردستانی سەربەتورکیادا پارتی کرێکارانی کورد (P.K.K) دامەزرا ، لە بەشە کوردستانی ئێرانیش وێڕای حیزبی دیموکرات ، ( کۆمەڵە ) دروست بوو کە دوایی لەگەڵ چەند ڕێکخراوێکی دیکەی مارکسی یەکیان گرت و ناویان لەخۆیان نا ( حیزبی کۆمۆنیست ) .

وە لە ساڵی (١٩٨٥) دا بۆ یەکەمین جار[1] لە بەشە کوردستانی سەر بەعێراق دا جموجۆڵی چەکداری ئیسلامیانە بەناوی ( لەشکری قورئان ) سەری هەڵدا کە باڵی سەربازی ( بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی ) بوو ، ئەو بزووتنەوەیەی وەک ڕێکخراوێکی نهێنی سەرەتایی

---

(١) دیارە بێ ئاگا نیم لە دروست بوون و سەرهەڵدانی کۆمەڵە چەکدارێک لە ساڵەکانی (١٩٨١ - ١٩٨٢) دا بەناوی( لەشکری ئیسلامی) - یەوە . بەڵام بە وردبوونەوە لە مێژوو و چۆنیەتی دروست بوون و سەرەنجامی ئەنگیان ، دەردەکەوێ کە چاکترین ناو بۆ پێناسەی ئەو کۆمەڵە چەکدارە ئەوەیە کە هەر لە زووەوە بەندە بۆی هەڵبژاردوون ، واتە ( لەشکری ئیستیلامی ) لەگەڵ ڕێزیشمان بۆ ئەو تاک تاکە موسڵمانە دڵسۆزو بەحەوهەرانەی کە بە هەڵەدا ڕەکەڵیان کەوتبوون .

لەکۆتایی حەفتاکان دا پێکهاتبوو، پاشان لە ساڵی ( ١٩٨٧ ) دا بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی زیاتر گەشەی کردو فراوانتر بوو و ناوەکەشی گۆڕرا بۆ ( بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقدا ).

ئەمە چاوپێداخشاندنێکی خێرا بوو دەربارەی مێژووی جووڵانەوەو ڕاپەڕینە ڕزگاریخوازەکانی گەلی کورد، کە بەمەبەستی وەدەست هێنانی ئەو مافە سروشتیو ڕەوایانە سەریان هەڵداوە کە خەوای میهرەبان و دادگەر بە هەموو گەل و نەتەوەیەکی بەخشیوون .

ئێستاش دەچینە سەر مەسەلەی سێیەم :

سێیەم : گەورەترین هۆی سەرنەکەوتنی ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد :

هەرکەسێک بە عەقڵێکی ئازادو ویژدانێکی ساغەوە سەرنجی جووڵانەوە ڕزگاریخوازەکانی گەلی کورد بدات، دڵنیا دەبێ کە ئەم هۆیانە سەرەکی ترین و گەورەترین بەرچو لەمپەری بەئەنجام نەگەیشتنیان بوو ون :

١- یەک نەبوون و دژایەتی نێوخۆ :

بەڵێ خوێنەری سەنگین ! پەرتەوازەییو دژایەتی یەکتر کردنی کورد چ لەسەر ئاستی کوردستانی بەرین و چ لەسەر ئاستی هەرکام لە پارچەو بەشەکانی ، گەورەترین هۆی سەرنەکەوتن و بێ ئاکامی سەرلەبەری ڕاپەڕین و شۆڕشە ڕزگاریخوازەکانی گەلەکەمان بووە ، بەپێویستیشی نازانم زۆر وەدوای سەلماندنی ئەم ڕاستییە بکەوم کە بەتایبەتی ئێستا بۆتە شتێکی بەڵگەنەویست . بەلام دەڵێم عارەب گوتوویانە ( السعيد مَن اتَّعَظَ بِغَيرِهِ ) کەچی ئێمە نەک لە غەیر ،بەندو دەرس لە تەجروبە تاڵ و گرچووبڕەکانی خۆشمان وەرناگرین !

٢- پشت بەخۆ نەبەستن و لەسەر لاقی خۆ نەوەستان :

ئەمیش یەکی دیکەیە لە هۆیە هەرە گرنگەکانی بێ ئەنجامبوونی

جموجۆڵە ئارادیخوازەکانی گەلەکەمان ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم ئەوە نیە کە ئێمسان هەوڵی پەیداکردنی دۆست و پشتیوانـــان نەدات و هەر بەتەنیا تێرا بچێ، چونکە پشت بەخۆبەستن و یارمەتی لەخەڵک خواستن پێکەوە دژ نین ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە پێش دەست پێ کردن توانای خۆمان بناسین و بە ئەندازەی ئەو توانایەی کە لەخۆمان دا شکی دەبەین دەست بێ بکەین بەکدیواری کارەکەمان لەسەر بنچینەی گومانا وی گفت و بەڵێنی خەڵکی منیات بنێیـــن . پێشینانیش گوتوویانە ( تێکوشینی بەتەمای جیرانان ئیشکــــە ) و ( پشتیش بەدەستی خۆت نەیخوریێنی خرووی ناشکێ ) .

٣ـ خۆشباوەڕی و فریوخواردن بە گفت و بەڵێنی هەندەران :

دەوری کاریگەری ئەم هۆیەش لە شکستەکانی هەرکام لە شێــــخ مەحموودو قازی موحەممەدو مەلا مستەفادا کە یەکەمیان ئینگلیــــزو دووەمیان ڕووس و سێ یەمیان ئەمریکا گفتیان دابوونێ بە زەقترین شێوە دەبینرێ .

لێرەدا قسەیەکی خۆشی یەکێک لە پێشمەرگەکانی سەردەمی کۆماری مەهاباددم کەوتەوە یاد . دەیگێڕایەوە کە تازە ( کۆمــــــار ) دامەزرابوو، شیعرێک بوو بوو بە ویردی سەر زمانی خەڵکەکــــــە بەتایبەت سوارەکان . کە ئاوازی شیعرەکە لەگەڵ هەوای نەرمەغاری ئەسپەکانیان دا زۆر چاک دەهاتەوە . بەلام بەداخەوە ئــــــــەو خاڵە پێشمەرگەیە بەس ئەم سێ دێڕەی لە شیعری گۆرین لەبیــــــر مابوون :

( زووکەن هەڵدەن ئاڵایە     ئیستالین پێشەوایە

بۆ کوردان وەک باب وایە ) !!

٤ ـ کەم بان بێ ئیخلاصی و ساغ نەبوونەوە بۆ مەبەست :

بەڵێ لەڕاستیدا زاڵبوونی ئارەزووەکانی نەفس و بەرژەوەندی یە

تاکیو تاقمییەکان بەسەر مەبەستە بەرزو پیرۆزەکان دا- بەتایبەت لەم دواییەدا- هۆیەکی زێدە کاریگەر بووە بۆ سەرنەکەوتنی زۆر لە سەرکردەو دەمڕاستەکانی کورد، وە ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین دەبینین زیادبوون و پەرەستاندنی ئەسڵەتی ناوبراو پەیوەندی یەکی ڕاستەوانەی هەیە بە بڵاوبوونەوەو گەشەکردنی بیروبۆچوونە ماددی و نائیسلامییەکانەوە . هەر بۆیەش ڕاستیی و ساغیی و یەکباری ی لە سەرکردەو ڕاسەرە پێشووەکان دا زیاتر بووە، چونکە ئەوان یان هەر دووربوون یان کەمتر کەوتبوونە ژێر تەئسیری بیرو بۆچوونە ماددی و بێ دینەکانەوەو بیروباوەڕی ئیسلامییانەیان ڕەگ و ریشەی خۆپەرستیی و دنیاویستی تێدا نەهێشتبوون و بۆ خواو خەڵک یەکلا بووبوونەوە .

٥ - ڕێکانەدانی سیاسەتی ئیمپریالیزمی جیهانی :

هەرچەندە ئەم هۆیە دەورێکی یەکجار کاریگەرو گرنگی هەبووەو هەیە لە سەرنەکەوتن و بێ ئاکام مانەوەی شۆڕشەکانی کورد دا . بەڵام بۆیە خستمە کۆتاییەوە . چونکە هەر ئەو هۆیانەی پێشەوە ڕێگا بۆ ئەمیان خۆش دەکەن . یان لانی کەم وادەکەن کە ئەم هۆیە بتوانێ دەوری خۆی ببینێ . ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە هەرکەسێک بێجگە لە دوژمنایەتیی زیان شتێکی تر لە دوژمنی یەوە چاوەڕێ بکات بەهەڵەدا چووەو زەینی خلیسکەی پێ بردووە !

تێبینی : بەپشتیوانی خوا لە بەشی پێنجەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا کە لەژێر سەرباسی: ( ئیمان چارەی دەردی " کورد " دەکات نەک پەرلەمان ) دا بەڕوونی دەکەینەوە کە چۆن بەهۆی ئیمان و ئیسلامەوە هەرکام لەم خاڵە لاوازانەی کە بوونە پەرچ و لەمپەری سەر ڕێگای جوولانەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد لادەچن و چارەسەر دەکرێن .

# بەشی دووەم

# گەلی کورد چی دەوێ ؟!

خوێنەری خۆشەویست !

بەپەسندی دەزانم کە دەقی ئەو ( باس ) ەی بەشێوەی ( محاضرة ) یەک لە ڕۆژی شەممەی ( ذو الحجة ) ی ڕێکەوتی ١٩٩١/٦/١٥ لە کۆڕێکدا کە ( نادي الأعلام العربي ) لە پیشاوەری پاکستان سازی کردبوو پێشکەشم کرد لەژێر سەرباسی ( القضية الكردية جذورها وطريق حلها ) ، لێرەدا وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی و لە وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرێ دا بینووسم :(1)

ئەمەش دەقی ( باس ) ەکەیە دوای وەرگێڕانی :

( برا ئازیزو بەڕێزەکان جوانترین بەخێرهاتنتان دەکەین و سڵاوی پیرۆزی ئیسلامتان ئاراستە دەکەین ( السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ) وە سەلامو ڕێزی برایانی تێکۆشەری خۆتانتان لەسەر زەوی کوردستانی بریندار پێ ڕادەگەیەنین بە سەرکردەو پێشمەرگەو پیرو گەنجەوە .

وە زۆر سوپاستان دەکەین و لەخوای بەخشەر داواکارین کە چاکترین پاداشتتان بداتەوە لەبەرانبەر سازکردنی ئەم

---

(1) کۆڕی ناوبراو کورێکی ڕۆژنامەیی ( ندوة صحفية ) بوو کە نوێنەری گەلێک لەو گۆڤارو بڵاوکراوە عارەبیيانەی تێدا ئامادە بوون کە لە پاکستان دەردەچن ، وە ژمارەیەک لە نوێنەرانی ئەو دامەزراوە ئیسلامیيانەی کە لە گۆڕەپانی جیهادی ئەفغانیدا کار دەکەن ، ئەوەندەی من ئاگادارم هەرکام لە گۆڤاری ( النفير ) و گۆڤاری ( المرابطون ) ئەم ( محاضرة ) یەیان بڵاوکردەوە .

کۆبوونەوەیەدا کە بەڵگەی هەستکردنە بە بەرپرسیاریتی لەئاقار کێشەی ڕەوای گەلی کوردی موسڵمانی ستەملێکراودا و گرنگیپێدانی .
برا خۆشەویستەکانم !
ناوو نیشانی ئەو باسەی کە ویستم پێشکەشتانی بکەم ئاوایە :
( کێشەی کوردو ڕەگ و ڕیشەکانیو ڕێ ی چارەسەری ) ، وە ئـــەم باسەتان لەم چەند خاڵەی خوارێدا بۆ کورتدەکەمەوە :
خاڵی یەکەم : گەلی کورد کێ یە ؟!
خاڵی دووەم : گیروگرفتی گەلی کورد چی یە ؟!
خاڵی سێیەم : ئەم گیروگرفتە کەی سەری هەڵداو لەکوێ وە هات ؟!
خاڵی چوارەم : گەلی کورد عەودالّی چ ئامانجێکە لە خەباتی سەختی زیاتر لە سەد ساڵەیدا ؟!
خاڵی پێنجەم : چۆن دەگونجێ بەشێوەیەکی ئیسلامییانە چـــارەی گیروگرفتی گەلی کورد بکرێ ؟!

خاڵی یەکەم : گەلی کورد کێ یە ؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە بەپێویستی نازانم کە بە قووڵاییو قوژبنەکانی مێژوودا ن دا بگێڕم ، چونکە گەلێک باس و لێکۆڵینەوە بە زۆر زمانی جیا جیا دەربارەی بنەڕەتی گەلی کوردو زیـــان و خوو و نەریتەکانی هەن ، هەرکەسێکدەیەوێ بەو باسەدا قـــووڵ بێتەوەو زیاتر بزانێ ، دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆو سەرچاوانــە .
بەڵام من هەر بەکورتی دەڵێم :
ـ لەبارەی بنەچەکەی گەلی کوردو هەویەی نەتەوەیییەوە بەتایبـەت لەنێو ڕۆژهەڵاتناسەکاندا مشتو مڕو بگرەو بەردە هەیە ، بەڵام ئەو ئەنجامەی کە لەسەری ڕێککەوتوون بەپێی ئەو سەرچـــاوەدر

بەڵگەنامانەی کە هیچ گومان و دوودڵییەک ناهێڵن ئەمەیە :
کە گەلی کورد گەلێکی ڕەسەنە کە لە دێرزەمانەوە لەو ناوچەیەی کە ئێستا تێیدایە نیشتەجێ بووەو، لە هەندێک لە قۆناغەکانی مێژووی دوورو درێژیشیدا دەوڵەتی پان و پۆڕی هەبوو ون .
وە ئێستا ژمارەی کوردان لە هەموو پارچەکانی کوردستانی دابەشکراودا نزیکەی ( ٢٠ ) ملیۆن کەس دەبێ .
٢ـ وە گەلی کورد موسڵمانەو ، ئیسلامی بە بەرنامە قبووڵ کردووە بە ڕێژەی ( ٩٨% ) وە لە سەردەمی خەلیفەی دووەم ( عومەری کوڕی خەتتاب ) خوا لێی ڕازی بێ ، بە ویست و ئارەزووی خۆی ئیسلامی وەرگرتووەو بڕوای پێ هێناوە .
وە مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە بەدەگمەن نەبێ لەنێوان سوپای ئیسلام و گەلی کورددا جەنگ ڕووی نەداوە ، ئەمەش لەسۆنگەی ئەوەوە بووە کە گەلی کورد بەماوەیەکی زۆر بەر لە هاتنی ئیسلام هیچ کیان و قەوارەیەکی سەربەخۆی نەبوو ـ وەک هەندێک کوردی ڕەگەز پەرست گومان دەبەن و لاف لێ دەدەن ـ بەڵکو لە ڕۆژهەڵاتەوە لەژێر نیری دەوڵەتی ساسانی و لە ڕۆژئاواوە لەژێر نیری دەوڵەتی بێزەنطیدا دەیناڵاند .
جا کاتێک ئیسلام بە دادگەری و بەزەیی و بەرنامە ئاسان و دڵگیرەکەیەوە هات ، کە عارەب بەسەر عەجەمدا و سپی بەسەر ڕەشدا بە چاکتر دانانێ ، بەڵێ لەکاتێکدا کە ئیسلام بە شێوە ڕەسەن و ڕاستەقینەکەی هات ، گەلی کورد لە ئامێزی گرت و ، بابای تینووی بیابانی گەرم و قاقڕ چۆن پێشوازی ئاوی سارد دەکات ئاوا بەپیریەوە هات و ، بە عەقڵ و ئاوەزی بڕوای پێ هێنا و لەقووڵایی دڵیەوە خۆشی ویست .
٣ـ وە هەر لەو کاتەوە کە گەلی کورد چۆ ژێر سایەی ئیسلام و بە

بەرنامەو ڕێبازی زیانی هەڵی بژارد خزمەتی کردو لەپێناوی سەرخستنیو بەرزکردنەوەی ئالاکەی دا بە سەرو ماڵ خۆی فیدا کرد ، وە بە خزمەتە گرنگەکانی شارستانەتی ئیسلامی دەوڵەمەند کرد بەتایبەتی لەبواری زانستو عەسکەری دا ، وە ( ابن الصلاح الشهرزوري ) و ( ابن الحاجب ) و ( ابن الأثير ) ی مێژوونووس و ( ابن الأثير ) ی فەرموودەناسیو ( صلاح الدين ) و ( مولانا خالد ) و ( احمد شوقي ـ امير الشعراء ) و ( البيتوشي ) و ( امجد الزهاوي ) و ( شيخ محمود الحفيد ) و ( سعيد النورسي ).. خوا لە هەموویان خۆشبێ ، تەنیا چەند نموونەیەکن لەو کەسایەتی ـ یە دیارو کاریگەرانەی کە گەلی کورد لە سێبەری ئیسلام دا پەروەردەی کردوون .

وە پێویستە لێرەدا ئامازە بۆ ئەوە بکەم کە گەلی کورد دەستی چاکەی بەسەر زۆر لە گەلە ئیسلامیەکانەوە هەیە لە بواری سوپاییدا ، چونکە ئەو گەلە کە بە ئازایی‌و چاونەترسی ناوی کردوە ، لە هەموو قۆناغەکانی دەوڵەتی ئیسلامیدا وەکو زرێ و قەڵغانێک بووە بۆی ، وە هەرکام لە بەربەرچدانەوەی هێرشی درندانەی خاچپەرستەکان بۆسەر جیهانی ئیسلامی بە سەرکردایەتی صەلاحەددینی ئەییوبیو ، پاسی کردنی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕۆژهەلاتو ڕۆژ .... ئاوایەوەو ، بەربەرچدانەوەی هێرشی ڕووسەکان لە سەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمدا بۆسەر ئێران و ، بەشداری کردنی عەشیرەتە کوردەکان بە سەرکردایەتی شێخ مەحموودی حەفید لە ڕاوەستان لەدژی ئینگلیز لە ساڵی ( ١٩١٨ ) دا ، بەس چەند نموونەیەکی هەڵوێستە مەردانەکانی ئەو گەلە مسوڵمانەن لە بەرگری کردنی لە نیشتمانی ئیسلامیو پاراستنی بوون و کیانی ئیسلام .

خاڵی دووەم : گیروگرفتی گەلی کوردی مسوڵمان چی یە ؟!

ڕەنگە هەندێککەس بەهەڵە وا حاڵی بووبن کە گیروگرفتی گەلی کورد ئەوەیە کە ناتوانێ لەگەڵ گەلە مسوڵمانە دراوسێکانیدا بژی ، یان گیروگرفتەکەی ئەوەیە کە دەیەوێ لە ئۆممەت و نیشتمانی ئیسلامی جیابێتەوەو سەربەخۆ بێ ، بگرە هەندێک لەوانە بەدگومانییان گەیاندوونیە ڕاددەیەک کە پێیان وایە ئەو گەلە مسوڵمانە ڕۆچووە لەئیسلامدا ، گیروگرفتەکەی ئەوەیە کە دەیەوێ واز لە ئیسلام بهێنێ - یان وازیشی لێ هێناوە ! - و بەرەو گومڕایی و سەرگەردانی پاشگەزبێتەوە ، دوای ئەوەی خوای بەرز خستوویەتە سەر ڕاستە شەقامەکەی خۆی !

بەڵام نەخێر گیروگرفتی ئەو گەلە هیچ کام لەم ئیحتیمالانەو وێنەی وانیش نیە ، بەڵکو گیروگرفتەکەی بریتیە لە :

( دان پێدا نەهێنرانێکی ڕاستەقینە بە کیان و بوونی وەک گەلێک کە مافی ژیانی هەیە لە خاک و نیشتمانی خۆیدا ، ژیانێکی ئازادانەی بەڕێز کە شایستەی ئینسان بێ ) .

بەڵێ برا ئیسلامییەکانم بەو خوایەی کە جگە لەوی هیچ خوا نیین گیروگرفتی گەلی کورد بەس ئەوەیە کە ئەو دەوڵەت و ڕژێمانەی کوردیان بەسەردا بەشراوەتەوەو نیشتمانی کوردیان لەنێودا بەشکراوە بە دان پێداهێنانێکی کردەیی - بگرە زۆر جاران تیۆری و دەمیش- دانی بۆ پێدا ناهێنن کە کوردیش گەلێکە نیشتمان و زمان و کیانی خۆی هەیە وەک هەموو ئەو گەلە مسوڵمانانەی کە ئۆممەتی ئیسلامییان لێ پێکهاتوە .

ئنجا ئەگەر هات و هەندێک لەوانەی داوای مافە سروشتیی و ڕەوایەکانی ئەو گەلە دەکەن بەهەڵە یان بەقەستی ڕێڵای خوار و خێچیان گرتەبەر، وەک پەنابردنە بەر بیردۆزە ڕۆژهەلاتیی و ڕۆژئاوایییەکان و شوێن کەوتنی بیرۆچکە بێ بڕواییەکان، ئەوە وەک لە هیچ خاوەن ویژدانێک شاراوە نیە ئەو هەڵوێستە هەڵانە هیچ لە هەقێتیو ڕەوایەتی مەسەلەی کورد ناگۆڕێ، چونکە هەق ئەگەر بە شێوازێکی ناهەقیش داوا بکرێ نابێتە ناهەق، بەڵکو تەنانەت ئەگەر شوێن کەوتووانی ناهەقیشداوای بکەن !!

حاڵی سێیەم : ئەو گیروگرفتە کەی سەری هەڵدا و لەکوێ وە هات ؟!

هەندێک کەسی ڕەگەزپەرست و زیادەڕۆ کە وەک پێویست بە ئیسلام ئاشنا نین، پێیان وایە ڕەگ و ڕیشەی کێشەی کورد بە قووڵایی زەوی مێژووی ئیسلامیدا ڕۆچووە، ئێمەش بۆ خستنەڕووی پووچەڵی ئەم دەعوایە بەس دوو بەڵگان دێنینەوە .

یەکەم : ئەگەر ڕاستبا ئیسلام ستەمی لە گەلی کورد کردبایەو مافەکانی لێ زەوت کردبان، ئەو گەلە لە پێناوی وەدی هێنانی مافە زەوتکراوەکانیدا بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی زنجیرە شۆڕش و ڕاپەڕینێکی یەک لەدوای یەکی ئەنجام دەدان، هەروەک چۆن لەم سەدەیەی دواییدا بینیمان، ئاخر ئەم گەلەبەناوبانگە[1] بە ئازایەتیو مل کەچنەبوون و بێ دەنگ نەبوونی لەئاقار ستەم و دەستدرێژی دا .

---

(١) ( قلقشندي ) لە کتێبی ( صبح الأعشى ) دا دەربارەی گەلی کورد گوتوویەتی :( الاکراد کالبروق اذا وثبوا وکالأسود اذا غضبوا ) . واتە : کوردەکان لەکاتی ڕاساندا وەک برووسکەو لەدەمی توورەبووندا دەڵێی شێرن .

دووەم : ئەگەر گەلی کورد بەو شێوەیە بوایە کە ئەوانە کومـــان دەبەن ، بابایەکی وەک ( صلاح الدین الأیوبي ) نەی دەتوانی بکاتە پلەی سەرکردایەتی بەهێزترین سوپای ئیسلام و ببێتە سەرۆکـــــی گەورەترین دەوڵەتی ئەو سەردەمە .

ئەمێتر گیروگرفتی گەلی کورد لە واقیعێکی ئیسلامیدا دروســـت نەبووە و رەگ و ریشەی ئەو بەڵا گەورە و ستەمە دزێوە لە زەمینــەی ئیسلامیدا نەرواوە ، بەڵکو ئەو گیروگرفتە دوای زاڵ بوونـــــی ئیمپریالیزمی جیهانی بەسەر دنیای ئیسلامدا پەیدابوو ، کە ئەمیش دوای نەمانی خەلافەتی ئیسلامی رووی دا ، ئەو خەلافەتەی کە بەهـــۆی نەخۆشییەکانی و لادانە جۆراوجۆرەکانی لە ئیسلام نەیتوانـــــی بەرهەڵستیی دوژمنە سەهیۆنی و خاچپەرستەکان بکات .

(١)

.........

کەواتە هەرکەسێک رازی بێ بە مانەوەی ئەم گیروگرفتە کـــە گیروگرفتی تێکرای موسڵمانانە نەک بەس گەلی کورد ، یان لانی کەم ئەو پەیمانە ئیمپریالیزمییە نەگریسەی کە گیروگرفتی ناوبــــراو و گەلێکی دیکەشی لە جیهانی ئیسلامدا پەیدا کردن ، بە ناشەرعـــی و ستەمکارانە نەزانی مانای وایە بە زمانی حاڵ کێلانە یان خــــۆ گێل کەرانە شایەدی ی دەدات کە بە نەخشە و پیلانەکانی کوفــــری جیهانی رازی یە ، دیارە خوای بەرزیش ئاگاداری کردووینــــەوە لە شوێن کەوتن و دۆستایەتی کردنی جوولەکە و دیانەکان و ...

فەرموویەتی :( یا ایها الذین آمنوا لاتتخذوا الیهود والنصــاری أولیاء بعضهم أولیاء بعض ومن یتولهم منکم فأنه منهم ... ) المائدة / ٥١ .

---

(١) چەند دێرێکم لێرەدا وەرنەگێڕان ، چونکە دەربارەی پەیمانـــی شوومی سایکس بیکۆ و چۆنیەتی دابەشکرانی جیهانی ئیسلامـــی و نیشتمانی کورد بوون ، کە پێشتر باسکراوە و گوتم با دووبـــات نەبێتەوە .

خاڵی چوارەم : گەلی کورد لە خەباتی سەختی زیاتر لە سەد ساڵەی دا مەوداڵی چ ئامانجێکە ؟!

ئەو ئامانجەی کە گەلی کوردی مەینەتبار بەدرێژایی مێــژووی تاڵی پڕ لە شۆڕش و ڕاپەڕینی ، وە بەدرێژایی ململانێی سیاسـیی و عەسکەری لەگەڵ ئەو دەوڵەت و ڕژێمانەی کە کوردستان و دانیشتــوو - انی یان بەسەردا بەشراوەتەوە ، بەدوای دا مەوداڵەو هەوڵـــی بۆ دەدات بەس ئەوەیە کە وەکە هەموو گەلانی دنیا حیساب بکــرێ و مافە ڕەوایەکانی وەدەست بهێنێ و ، هیچ کەس نەی چەوسێنێتــــــەوەو زەوی و خاکی یان هیچ مافێکی دیکەی لێ زەوت نەکات ، چونکـــــە ئەو گەلەش وەک هەموو گەلانی دنیا هەموو ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندی - یانەی هەن کە پێیان بچێتە ڕیزی گەلانی دنیاوە بەبێ زیـــادو کەم ، مادام وایە بۆی هەیە وەک هەر گەلێکی دیکە کە کیـــان و قەوارەی نەتەوەیی خۆی هەبێ لە ڕیزی ئەو گەل و کۆمەڵانــــــەدا کە ئۆممەتی ئیسلامیان لێ پێکهاتوە .

وە گەلی کورد ئەو مافەشی نە لەسەر بنچینەی ڕەگەزپەرستـــی و بە هاندەری دەمارگیری نەفامیی داوا دەکات و، نە لەسەر حیسابـــی ماف و بوون و کیانی خەڵکی دیکە ، بەڵکو لەسەر بنچینەی هـــەق و دادگەری و بە هاندەری لابردنی ستەم و بەربەرچدانەوەی دەســــــت درێژی ، خوای بەرزیش فەرموویەتی : ( ... لاتَظلمونَ ولاتُظلَمُون )، البقرة / ٢٧٩ . واتە :

نە زوڵم بکەن ، نە بهێڵن زوڵمتان لێ بکرێ !!

هەڵبەتە ئکووڵیشمان لەوە نیە کە هەندێک لەو تاقم و پێرانەی داوای مافە نەتەوایەتیەکانی گەلی کورد دەکەن هەندێک جـــاران هەڵوێستی ناقۆلایان نواندوون و ڕووی گەشی مەسەلەی گەلی کوردیان

ناشیرین کردوەو بەزاندوە ، بەڵام ئەوانەش دیسان تا ڕادەیەک عوزرو بەهانەیان هەیە ، چونکە وەک گوتراوە ( پیاو کە بە ڕووباری داچوو دەست بۆ پووشیش درێژ دەکات !! ) ، جا ئەگەر بمانەوێ دادگەرانە حوکم بدەین و سەرنجی دیوی نێوەوەی شتان بدەین و بە دیوی دەرەوەیان وازنەهێنین ، نابێ بەتەنیا لۆمەو سەرکۆنەی ئەو تاقم و کۆمەڵە لارێیانە بکەین ، بەڵکو بە پلەی یەکەم ئەو ڕژێمانە تاوانبار بکەین و ڕووی ڕەخنەو گلەیی یان تێ بکەین کە بە ئاگرو ئاسن ڕەفتاریان لەگەڵ گەلی کورد دا کردوەو ناچاریان کردوە کە پەنا بەرێتە سەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواو دەستەو داوێنی ڕێچکەو بیردۆزە بێ بڕوایەکانیان ببێ و، وەک ئەو کەسەی لێ بەسەربێت کە دەڵێ :( تداوَیْتُ بالذي هو الداء ) ، بە شتێک خۆم دەرمان کرد ، کە هەر ئەو دەردی ڕاستەقینە بوو . ......... (١)

ئێستاش کە هەتا ڕادەیەک زانیمان دەردی گەلی کورد چی یەو چی دەوێ ، کاتی ئەوە هاتوە بزانین لە چ ڕێ یەکەوە بەو کامەو مرادە دەگات و مەخسوودی حاسڵ دەبێ !

---

(١) خاڵی پێنجەم زیاتر پەیوەندی بە بەشی پێنجەمی ئەم لێکۆڵینەوەیە هەیە ، بۆیە لەوێ دا دەینووسین .

# بەشی سێیەم

# لە ڕێی دیموکراسی و پەرلەمانەوە دەگەینە چی ؟!

خوێنەری بەڕێز !

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەی سەرێ پێویستە لەپێشەوە چەند خاڵێک بخەینەڕوو :

١- دیموکراسی یانی چی ؟!

دیموکراسی کە ئێستا بۆتە زاراوەیەکی سیاسی بەڕمێن لە ڕیشەدا وشەیەکی ( یۆنانی ) یەو لە دوو برگە پێکهاتوە ؛ ( دیمۆس ) واتە ( گەل ـ شعب ) ، وە ( کراسی ) واتە ( حوکم ) کەواتە : دیموکراسی یانی ( حوکمی گەل ) ، چ وشەیەکی شیرین و بریقەدار !! دیارە مەبەستلە ( حوکمی گەل ) ئەوەیە کە خەڵک و دانیشتووانی ناوچەیەک یان زیاتر لەنێو خۆیان دا ڕێک بکەون کە بەرنامەو پەیڕەوی ژیان بۆخۆیان دابنێن و حوکمڕان و کاربەدەستانی مشوورخۆری خۆیان دیاری بکەن .

بۆیە هەمیشە لەگەڵ وشەی ( دیموکراسی ) دا وشەی ( هەڵبژاردن ـ إنتخاب ) یش هەیە ، چونکە تاقە ڕێگایەککە بگونجێ دیموکراسی لێوە بەڕێوە ببرێ ( هەڵبژاردن ) ە ، مەبەستیش لە هەڵبژاردن ئەوەیە کە ( گەل ) لەنێو خۆی دا ژمارەیەکی دیاری کراو لە نوێنەرانی خۆی هەڵدەبژێرێ بۆئەوەی بەناوی ( گەل ) ەوە کۆڕو ئەنجومەنێک پێک بێنن کە پێی دەگوترێ ( پەرلەمان ) ، یان ( کۆنگرێس ) .

هەڵبژاردنیش دەگونجێ بەچەند شێوەیەکی جیا جیا ئەنجام بدرێ

که زەقترینیان ئەمانەن : بازنەیی ( دائري ) ، گوێزەیی کراوە ــ ( نسبي مفتوح ) ، گوێزەیی داخراو ( نسبي مُغلَق ) .

( پەرلەمان ) یش کە بەرهەمو ( بیت القصید ) ی دیموکراسی یە ئەو کۆڕو کۆمەڵەیە کە ( گەل ) بە زۆرترین دەنگ هەڵی بژاردوون بۆ حوکمڕانیو بەرنامە دانان و هەرچی گەل پێویستی پێی هەبێ لە هەموو وردو درشتی ژیانی دا .

٢ــ دیموکراسی لەکوێ وە سەری هەڵداو بۆچی ؟!

دیموکراسی سەرەتا بەشێوەیەکی سادە چەند سەدەیەک بەر لە لەدایکبوونی ( مەسیح ) سەلامی خوای لێ بێ ، لەنێو یۆنانیەکاندا سەری هەڵدا ، وەکبریتی ( بَدیل ) ێکبۆو ئایین و بەرنامانەی کە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لەخواوە بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ژیانی مرۆڤایەتیەیان دێنا ، دیارە سەرچاوە مێژوویی ـ یەکانیشهەوالمان دەدەنێ کە یەکێکلە نەریتو ڕێ و ڕەسمەکانی یۆنانیەکان بریتی بووە لە پشتتێکردنی هیدایەتو بەرنامەکانی خوای پەروەردگار ، تەنانەتهەندێکلە توێژەرەوانی قورئان فەرموویانە ئەم ئایەتە :( فلما جاءتهم رسلهم بالبینات فرحوا بما عندهم مِنَ العلم وحاق بهم ماکانوا به یستهزؤن ) غافر/ ٨٣ . دەربارەی فەیلەسوفەکانی یۆنان و هەڵوێستیان لەئاقار پێغەمبەرانی خواو بەرنامەکانیان دەدوێ .

بەهەرحاڵ هەر ئەو هەموو کەلەپوورە زۆرو بۆرو بێ هێزو پێزەی کە پێی دەگوترێ ( فەلسەفەی یۆنانی ) بەڵگەو نیشانەی پتەوی ڕاستیی ئەو ڕایەیە کە گوتمان .

ئنجا بێگومان ئینسان لەهەر کاتو جێیەکدا هیدایەتو بەرنامەی خوا بزر بکات ، چاری ناچارە کە هەوڵ بدات بەهەر شێوەیەکبووە ئەو کەلێن و بۆشاییە پڕبکاتەوەو بەرنامەو بەپەیڕەوێکبۆخۆی سازبکات ، گوتراویشە ( الحاجة أمُّ الأختراع ) ..

ـەو بێـەشـدەگونجێ بگوترێ : ( الحَيْرةَ عن الشرع أُسّ الأبتداع ) .
ئنجا بۆ جاری دووەم دیموکراسی لەپێشەوە لە ئەورووپاو پاشان لە ئەمریکادا کە میراتگری ئیغریقیو یۆنانییەکانن ، سـەری هەڵدایەوە ، چونکە لەسەرێکەوە ئەو قابین و بەرنامەیەی کە (عیسی) سەلامی خوای لێ بێ هێنابووی هەم لە ڕۆژگاری خۆی دا دژایەتی زۆریان کردو ، هەم دوای خۆشی هەتا توانیهان شێواندیان و دەستکاریبان کرد تا وای لێ هات کە کەڵکی ئەوەی پێوە نەمابوو ژیانی تاکو کۆمەڵ ڕێک بخاو بەڕێوەبەرێ .(١) وە لەسەرێکی دیکەشەوە هەموو شێوەکانی دیکەی حوکمڕانییان تاقی کردبوونەوەو.. جەربا ندبوون هەر لە تیۆکراسیو بیرۆکراسیو دیکتاتۆری بەوە هەتا پادشایەتیو تاقە حیزبیو سەربازی و .. هتد کە ئازارو ئێش و مەینەتییەکی زۆریان بەدەست هەرکامێکیانەوە چێشتبوو ، بۆیە سەرەنجام گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە دیموکراسی چاکترین و دادگەرانەترین جۆری حوکمڕانییەو ، لەڕاستیشدا ئەگەر بوونی خوای پەروەردگارو هیدایەتو بەرنامەکەی لەگۆڕێ دا نەبێ ، لە جەنگەڵ و چغوردی نەفامانەی بیردۆزەو ڕژێمە مرۆڤگردەکان دا ( دیموکراسی ) لە هەموان وێچووترو لەبارترەو لە هەقەوە نیزیکترە ، بەڵام هەقیش نیە !!
کەواتە :
پوختەی قسان ئەوەیە کە دیموکراسی چ بەشێوە سادەو سەرەتایی ـ یەکەی سەردەمی یۆنانیو ڕۆمانەکانیو ، چ بە بەچمی نوێو تازەی ئێستای ، پێداویستی ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگایەکی لە بەرنامەی

(١) پێویستە ئەوەش بگوترێ کە قابینی مەسیحی هەر لە ئەسڵیشدا بۆ کۆمەڵ و قۆناغێکی تایبەت و دیاری کراو هاتبوو ، نەک بۆ خەڵک و قۆناغی ئەوسای ئەورووپاو ئەمریکا ، بەڵکو ئەوەی ئەم ئەرکەی پێ سپێرراوە بەرنامەی هەمیشەیی سەرتاسەری مرۆڤایەتی یە کە ئیسلامە .

ڕاست و ساغی خوا بۆ هەواڵ هێناویەتەدی و، درەختێکی میوەو بەر تاڵە کە لە زەمینەی بەتاڵ و حەتاڵی بۆشایی فیکری ( الفـــراغ العقائدي ) خەڵکێکی بێ بەرنامەو سەرگەردان دا ڕوواوەو خەملاوە .

٣- بەرهەمی دیموکراسیی پەرلەمان لە شوێنی لەدایکبوونیان دا :

کاتی خۆی – واتە پێش‌سالانی دەست‌پێکردنی ( بیرۆیسترۆیکـا و گلاسنۆست ) ی گۆرباتشۆف – کە لەگەڵ برادەرە مارکسـی و شیوعییەکان دا دەربارەی پووچەڵیی گەندەڵی مارکسیزم و کۆمۆنیـزم دەدوایین و بە بەڵگەی عەقڵ و زانست و هەواڵ و مەعلووماتی ڕاست لەبارەی ئەو واقیعەی کە لەسەر سوێ ی هەرەس‌بوو . بەڵام ئەوان لێی بێ ئاگاو چەواشەکراو بوون ، بۆمان دەسەلماندن کە بەدوای کڵاوی خوارو ڕێچکەی ناهەموار کەوتوون و دەستیان لەبنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەردەچێ، لەئاکامدا ئەو سووژن و دریشەیەی پینەوپەڕۆی بیردۆزەی شڕو دڕاوی بیرۆچکەکەیانی پێ دەکەن لەدەستیان هەڵدەچێ ! سەرەخەری یان دەکردو نەیان دەسەلماند . بەڵام دوای ئەوەی دەهۆڵ دڕاو تەقەی بڕاو بیرۆچکەی گۆڕین بە حوکمی یاسای عەقڵیی زانیاری ( زادەی مرۆڤ حوکمی خاوەنەکەی هەیە )[1] بەداسی سروشت ( فطرة ) ی نەگۆڕی ئینسان ملی هەڵبڕاو، لەبەر سندانی واقیعی کۆمەڵگا بە چەکوشی ڕەوتی ژیان و پێداویستییەکانی گوزەران وردو خاش‌کراو، هەر لەو شوێنەدا کە تێیدا لەدایک بوو بوو فرێ درایە زبڵدانی مێژووەوەو هەزارو یەک‌نەفرینی لێ کرا . بەڵێ دوای ئەوە هەموو ئەو برادەرە دڵگەرمانە – مەگەر تاک و تەرای بێ ئاگا لە جەنگ و هەراسەری ( تقدیس ) یان سۆ

(١) خوا هەقە کاتی خۆی ( مارکس ) یش بەی بەو ڕاستییە گرنگـە بردبوو و تەنانەت کردبووشی بە مەحکەمترین پایەو بێ لـە چوارپێی دیالکتیکەکەی !! بەڵام وادیارە خۆی و بیردۆزەکەی فەرامۆش کردبوو کە ئەوانیش ملکەچی هەمان یاساو دەستوورن و بە حوکمی ( کل نفس ذائقة الموت ) دەبێ هەموو کەس و شتێک – جگە لە خوای بەدیهێنەری کەس و شتان – تامی مەرگ بچێژن !!

هەق و ڕاستی دانەواندو فزەیان لێ بڕا .

بەڵێ لەڕاستیدا بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنی هەر بیروبڕوای تازەو بیروباوەڕێک و پەی بردن بە شکست یان سەرکەوتنی ، چاکترین و نیزیکترین ڕێگا ئەوەیە کە سەرنج بدرێ داخوا لەشوێنی لەدایک بوونیو لە هەرێتی لاوی و پێگەیشتنیدا چۆن بووەو چی کردوە !

جا ئەگەر بەو چاوەی کە گوتمان سەیری دیموکڕاسی بکەین و ، بەو پێوەرە بیپێوین و لە مەحەکی بدەین بە گەلێک ئەنجامی گرنگ و سەرسوورهێنەر دەگەین :

یەک : دوو جەنگی جیهانی یەکەمو دووەم بەمەبەستی وڵاتداگیرکردن و بازاڕ گەرمکردن و کارگە وەگەڕخستن ، کە زیاتر لە (٧٠) ملیۆن کەسیان تێدا بوونە سووتەمەنی !

دوو : چەندان جەنگ و هەرا نانەوەی وەک : ڤێتنام ، ئەفغانستان، عێراق و ئێران ... کە جگە لە قەلاچوکردنی خەڵکی بێ تاوان و ئێرا تر کارکردنی کارگەو فابریقەخانەی چەکە کوشندەکان هیچ بەرهەمێکی دیکەیان نەبوو .

سێ : هێشتنەوەو چارەسەرنەکردنی چەند گیروگرفتو کێشەیەکی گرچووبڕ کە ئەگەر دەوڵەتە دیموکڕاسییەکان ! بیانەوێ بەئاسانی چارەسەر دەکرێن ، بۆ وێنە : کێشەی گەلی کورد ، فەلەستین ، کشمیر ... هتد .

چوار : دزین و بردنی خێروبێرو چاکترین شتی وڵاتانی ئەو خەڵکەی ناویان لێ ناون جیهانی سێیەمو ، لەباتی ئەوە ناردنی شەڕو خراپەو زیان بەخشترین شتی خۆیان وەک : بیردۆزە پووچو ژەنگاوییە ماددییەکان ، خوو و نەریتە گەندەڵ و پووچەکان ، کیمیایی و چەکە کوشندەکان ، سەرباری نەخشەو پیلانە گڵاوەکان بۆ ئەو ڕووت و دیکتاتۆرە کارتۆنییە بەکرێگیراوانەی کە وەک داشی دامەوان بەدەستیانەوە !

پێنج : نزم‌بوونەوەو دابەزینی ئاستی لایەنە ئینسانیو مەعنەویەکانی مرۆڤ و، پەرەسەندنی خووە شەیتانیو ئاژەڵیەکان و دەگمەن بوونی ڕەوشتە بەرزەکان و ، بەرەسەو قانوونی دان پێداهێنانی زینا ، نێربازی ، مەی‌خۆری ، قومار ، سوودخۆری .. هتد .

کە لە ئەنجامی ئەو بێ ڕەوشتیو تاوان و خراپانەدا دەیان نەخۆشی دەروونیو عەقڵیو کۆمەڵایەتیو جەستەیی .. سەرتاپای وڵاتیان تەنیوەتەوە ، کە خۆکوژی ( إنتحار ) و شێتیو دڵەڕاوکەو ناڕامیو هەست‌کردن بەتەنیاییو بەپووچو بێ حیکمەت لەقەڵەم دانی ژیان و ئایدزو ... هتد چەند نموونەیەکن لەو نەخۆشیانە .

جا لەڕاستیدا ئەگەر بمەوێ هەموو ئەو خراپەو ئاشووبو ناخۆشیو نەخۆشیو پیسیو گەندەڵیەی کە لەسایەی ڕژێمی دیموکراسیدا وڵاتە ناموسڵمانەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەتایبەتیو سەرتاپای جیهانی بەگشتی گرتۆتەوە پێویستە چەند بەرگ کتێبی قەبە بنووسم ، بۆیە بەوەندە وازدێنمو خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەو کتێب و سەرچاوانە دەکەم کە تەرخان کراون بۆ جۆرە بابەتانە . (۱)

ئنجا خوێنەری بەڕێز دەتوانین بەئاسانی وەڵامی پرسیاری ( لەڕێ ی دیموکراسیو پەرلەمانەوە دەگەینە چی ؟! ) بدەینەوەو بەڕاشکاوی بڵێین :

ئەگەر گریمان زۆر خاوەن بەخت و چارە بین و وەک ئەورووپی و ئەمریکاییەکان بتوانین لەگەڵ ( دیموکراسی ) دا ڕاست بکەین و

---

(۱) بڕوانە سەرنجی ( الأنسان ذلک المجهول ) ی آلکیس کارل و ( إنسانیة الانسان نقد علمي للحضارة الغربیة ) ی رینیه دوبو، کە هەردووکیان خاوەنی پاداشتی نۆبڵن ، هەروەها کتێبی ( مصیر البشریة ) ی لیکونت دی نوی و ( امریکا التي رایت ) ی سید قطب و ( پیرۆیسترۆیکا ) ی گۆرباتشۆف .

چاک بەرێوەی بەرین ، ئەوپەڕی ئەوپەڕی دەگەینە هەمان ئەنجام و بەرهەمی ( دڵگیرو شیرین ) کە خەڵکی ئەو شوێنانە پێی گەیشتوەو وەک سنێک لە جەوالێک لەو پێنج غالانەدا کە ڕابردن شتێکمان لێ خستەڕوو !!

ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە ئایا ئێمە وەک گەلێکی مسوڵمان کە خوا هستوویەتیە سەر ڕاستە شەقامی خۆی و لە ئیمان و ئیسلام بەهرەمەندی کردووین و بەرنامەو پەیڕەوی تێروتەواوی ئیسلاممان لەبەردەست دایەو ، ئەو بەهانەیەشمان نیە کە ئەورووپی و ئەمریکیەکان کاتی خۆی هەیان بووە ـ نەک ئێستا ـ کە ، ئاییێکی ڕاستو ساغیان نیە ، بۆمان هەیە لە ڕووناکیەوە بەرەو تاریکی و لە زانیاریەوە بەرەو نەزانی و ، لە تێگەیشتنەوە بەرەو نەفامی بگەڕێینەوە ؟!

نەخێر چونکە خوای پەروەردگارمان پێمان دەفەرموێ :( ثم جعلناک علی شریعة مِنَ الأمر فَاتَّبِعْها ولاتَتَّبِعْ أهواء الذین لایعلمون ) .(1) الجاثیة / ١٨ .

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە کە بچینە سەر بەشی چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەو بەراشکاوی و بێ پەردەو تەمومژ هەڵوێستی ئیسلام سەبارەت بە دیموکراسی و پەرلەمان بخەینەڕوو و ڕابگەیەنین : ( لِیَهلکَ مَن هَلَکَ عن بیِّنةَ ویحیی مَنْ حیَّ عن بیِّنةَ ) الأنفال /٤٢ .

تێبینی : لە بەشی پێنجەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا ( ئیمان چارەی دەردی کورد دەکات نەک پەرلەمان ) ئەو مەسەلەیە ڕوون دەکەینەوە کە چۆن دیموکراسی و پەرلەمان لەئاقار چارەسەرکردنی کێشەی ڕەوای کورددا دەستەپاچەو کلۆڵن و هیچیان لەدەست نایەت .

---

(1) واتە : دوایی تۆمان خستە سەر بەرنامەیەک لە ئایین ، دە شوێنی وی بکەوەو ، مەکەوە دوای ئارەزووی ئەو ـە کە نازانن !

# بەشی چوارەم
# دیموکراسی لە تەرازووی ئیسلام دا

خوێنەری خۆشەویست !

هەرچەندە ئێمە لەم بەشەدا بەس دەمانەوێ حوکم و هەڵوێستی ئیسلام لەبارەی دیموکراسی و پەرلەمانەوە بخەینەڕوو، بەڵام بەپێویستی دەزانم بەرلەوەی بچینە سەر ئەسڵی مەبەست ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ دەربارەی حەقیقەت و ماهیەتی دیموکراسی بخەمە پێش چاو :

وشەیەکی بریقەدار و بۆش

بەڵێ لەڕاستیدا وشەی ( دیموکراسی ) کە ئێستا ـ بەتایبەتی پاش هەرەس هێنانی دەوڵەتە کۆمۆنیستەکان ـ بۆتە بنێشتە ئینکەی سەر زاری خەڵکی و لە گەلی ئێمەیان کردۆتە ( حەوت دەرمانە ) و سەد و یەک شاخ و باڵی لێ دەنێن، هەرکەسێک ئازادانە بیربکاتەوە و هەق و ناهەقان لێک بکاتەوە دەزانێ کە جگە لە وشەیەکی بریقەدار و بۆش چیدی نیە .

وە لەڕاستیدا وشەی ناوبراو بۆ مرۆڤایەتی ئەم ڕۆژگارە کە لەسۆنگەی دوورەپەرێزی و بێ بەش بوونی لە هیدایەت و بەرنامەی خواوە زۆر لەمێژە بەدەست ڕژێمە دیکتاتۆرەکان ـ بە زاراوی ئیسلام نەفامی و طاغووتیەکان ـ ەوە دەتلێتەوە و لەسایەی زەبوونی و کۆیلایەتییەک کە لە بیابانی ئیشک و گەرمی ( شارستانەتی ماددی !! ) دا گیرۆدەی بووە . لە هەموو وشەیەکی تر شیرینتر و

هەق و ڕاستی دانەواندو فزەیان لێ بڕا .
بەڵێ لەڕاستیدا بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنی هەر بیروباوەڕێک و پەی بردن بە شکست یان سەرکەوتنی ، چاکترین و نیزیکترین ڕێگا ئەوەیە کە سەرنج بدرێ داخوا لەشوێنی لەدایک بوونیو لە هەرێتی لاوی و پێگەیشتنیدا چۆن بووەو چی کردوە !
جا ئەگەر بەو چاوەی کە گوتمان سەیری دیموکراسی بکەین و ، بەو پێوەرە بیپێوین و لە مەحەکی بدەین بە گەلێک ئەنجامی گرنگ و سەرسووڕهێنەر دەگەین :
یەک : دوو جەنگی جیهانی یەکەمو دووەم بەمەبەستی وڵاتداگیرکردن و بازاڕ گەرمکردن و کارگە وەگەڕخستن ، کە زیاتر لە (٧٠) ملیۆن کەسیان تێدا بوونە سووتەمەنی !
دوو : چەندان جەنگ و هەرا نانەوەی وەک : ڤێتنام ، ئەفغانستان، عێراق و ئێران ... کە جگە لە قەڵاچۆکردنی خەڵکی بێ تاوان و ، خێراتر کارکردنی کارگەو فابریقەخانەی چەکە کوشندەکان هیچ بەرهەمێکی دیکەیان نەبوو .
سێ : هێشتنەوەو چارەسەرنەکردنی چەند گیروگرفت و کێشەیەکی گرچووبڕ کە ئەگەر دەوڵەتە دیموکراسییەکان ! بیانەوێ بەئاسانی چارەسەر دەکرێن ، بۆ وێنە : کێشەی گەلی کورد ، فەلەستین ، کشمیر ... هتد .
چوار : دزین و بردنی خێروبێرو چاکترین شتی وڵاتانی ئەو خەڵکەی ناویان لێ ناون جیهانی سێیەمو ، لەباتی ئەوە ناردنی شەڕو خراپەو زیان بەخشترین شتی خۆیان وەک : بیردۆزە پووچو زەنگاوییە ماددییەکان ، خوو و نەریتە گەندەڵ و بووچەکان ، کیمیایی و چەکە کوشندەکان ، سەرباری ئەشنەخشەو پیلانە گڵاوەکان بۆ ئەوەو تاغووت و دیکتاتۆرە کارتۆنییە بەکرێگیراوانەی کە وەک داشی دامە وان بەدەستیانەوە !

بدەین و، وردیش بین بۆ پەی بردن بەو پەنجە نهێنیانەی کە بەهۆی پارەو سامان و ماددەوە سیاسەتی جیهانی ئاراستە دەکەن و دەی جوولێنن ، زۆر چاک دڵنیا دەبین کە وشەی ( حوکمی گەل بۆ گەل ) لە وشەیەکی بریقەدارو بۆش بەولاوە چیدی نیە .

ئنجا ئەمە هەمووی سەبارەت بەو ڕژێم و دەوڵەتانە کە لەگەڵ دیموکراسیدا ڕاستدەکەن ، بەڵام ئەگەر ئەو ڕژێمانە بکەینە جێ ی سەرنج کە زیاتر وەک دروشمێک سوود لە دیموکراسی وەردەگرن ئەوە دەبینین کە ڕاست ئەو پەندە کوردی یە بەسەر دیموکراسی دا دەچەسپێ کە دەڵێ ( بووکمان گەلێک جوان بوو ، بالووکەشی لە لێوی هات !! ) .

مەسەلەی سەرکەوتنی ( بەرەی ئیسلامی ڕزگاریخوازی جەزائیر ) پش لەڕێ ی هەڵبژاردنی دیموکراسیانەوەو پاشان سەرکوتکردنی و دەستلێوەشاندنی هەر بەناوی دیموکراسی و بەرژەوەندی گەل و وڵاتیشەوە !! چاکترین نموونەی ئەو جۆرە دیموکراسیەیە .

کەواتە :

نەخێر دیموکراسی ( حوکمی گەل بۆ گەل ) نیە ، بەڵکو حوکمی کۆمەڵێک خەڵکی بامانداروزمان لووس و تەڕدەست و خاوەن توانایە لە مەیدانی پڕوپاگەندەکردن و فریودان و سەرنج ڕاکێشانی جەماوەردا ، بەسەر گەل دا .

دووەم : ئایا دەگونجێ گەل بۆخۆی بەرنامەی ژیانی دابنێ ؟!

دەڵێین نەخێر ، چونکە :

أ ـ ئینسان تەنیا بەحوکمی عەقڵ و زانست بەڕێوە ناچێ ، بەڵکو هەست و نەست و ئارەزووەکانیشی ڕۆڵێکی کاریگەریان هەیە لە ئاراستە کردن و بەڕێوەچوونیدا ، وە بەس لەکاتێکدا مرۆڤ دەتوانێ جڵەوی نەفس و ئارەزووەکانی توند بکات و خۆی کۆنترۆڵ ( ضبط ) بکات کە خوا بناسێ و بڕوایەکی ڕاست و ساغی هەبێ ( وأما مَن خافَ مقامَ

رَبِّهِ ونَهىٰ النفسَ عنِ الهَوىٰ ... ) النازعات / ٤٠ .

ئنجا دیاره خەڵکێک کە دیموکراسی دەکەنە بەرنامەی ژیانیان و پەرلەمان لەجیاتی خوا دەپەرستن ـ وەک دوایی ڕوونی دەکەینەوە ـ سروایان نامێنێو نەفس و شەیتان تەواو بەسەریان دا زاڵ دەبێ و جڵەوی عەقڵ و هۆشیان بە ڕەشەبای نەفس و ئارەزووەکانی ئەگەر نەشکوزێتەوە تەواو خەفەو بێ شۆق دەبێ .

ب ـ دیسان ـ مرۆڤ ـ بە تاک و کۆمەڵی یەوە ـ هەرچەندە زانــــا و دانا بێ ، زۆر لەوە کەمترە کە بتوانێ پەیڕەوو بەرنامەی ژیانـی دانێ ، چونکە ئینسان لە ژیانی دنیای دا پەیوەندی بەخـــۆی و خەڵک و خوا و دەوروبەری یەوە هەیەو ، ئەو پەیڕەوەی کە ژیانـــی ڕێک دەخات پێویستە لە سەرچاوەیەکەوە بێت کە زانیاریو ئارەزایی تەواوی دەربارەی هەرچواریان هەبێ ، دەنا ناتوانێ جۆرو چۆنیەتی ئەو پەیوەندی یانە لەسەر بنچینەیەکی ڕاست و حەقیقی بنیات بنێ، ئاشکراشە کە جگە لە خوای پەروەردگار هیچ سەرچاوەیەکی دیکە نیە ئەوەی لەتوانادا بێ .

حەزیش دەکەم هەموو ئەوانەی بە مستە ئاوێکی زانست کەوتوونە مەلەو پێیان وایە ئینسان ڕازو نهێنیو مەتەڵی هەموو شتەکانـــی ، زانیوە ، سەرنجێکی وردو قووڵی کتێبی ( الأنسان ذلك المجهول ) ی آلکیس کارل[1] بدەن تاکو تۆزێک بێتەوە سەرخۆ !

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە بچینە خزمەت دەقەکانی ئیسلامو بزانین دیموکراسی لە بەرنامەی خوادا چۆنەو چ حوکمێکی بەسەردا دەدات !

---

(١) ئەم نووسەرە کابرایەکی فەرەنسی یەوکتێبەکەشی هەر بەو زمانـــە نووسیوەو پاشان وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عارەبی .

## حوكمی ئیسلام دەربارەی دیموكراسی

وای بەچاك دەزانم بۆ ئاسان بوون و زیاتر ڕوون بوونەوەی ئەم مەسەلە گرنگە لەچەند خاڵێكدا بیخەمەڕوو :

یەكەم : زەقترین شت كە لە دیموكراسیدا دێتەبەرچاو ئەوەیە كە لەسەر بنچینەی بڕوا پێ نەبوون و لەبەرچاو نەگرتنی خوا جل جلالە ـ دامەزراوە ، واتە هەرچەندە بەڕواڵەت دیموكراسی هەقی بوون و نەبوونی خوای نیە ، بەڵام لەڕاستیدا بەزمانی هەڵوێست و ڕەفتار بە نەبووی حسێب كردوە ، كەواتە ( دیموكراسی جۆرێكە لە جۆرەكانی بێ بڕوایی ) .

هەڵبەتە كەسێكیش هیچ حساب بۆ خوا نەكات حەوجار حساب بۆ ئەو مەسەلانە ناكات كە لەو ئەسڵ و بنچینە مەزنەوە سەرچاوەیان گرتوە ، وەك بڕوا بەڕۆژی دوایی و پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام و ... هتد .

دووەم : مادام دیموكراسی جێدار ( بدیل ) ی دین بێ ، كەواتە هەرچی كۆڕی پەرلەمان بڕیاری لەسەردا و پێی پەسند بوو ، ئەوە دەبێتە یاسا ( قانون ) و جێگای بڕیارەكانی شەرع دەگرێتەوە . (١)

سێیەم : مادام هەرچی پەرلەمان بڕیاری لەسەر بدات ڕەت كردنەوەی نەبێ و یاسایەك بێ هیچ كەس توانای سەرپێچی لێی نەبێ و لەسەری سزا بدرێ ، كەواتە : پەرلەمانی هەڵبژێرراو و پەسندكراو و

---

(١) بۆ وێنە : ئەگەر هات و سبەینێ لە كوردستان دا لەسەر بنچینەی دیموكراسی پەرلەمانێك دروست بوو و زۆربەی ئەندامانی ئەو پەرلەمانە بڕیاریان دا ـ وەك لە وڵاتانی ڕۆژئاوا باوە ـ زینا و مەی خۆری و قومار و سودخۆری و ... هتد بەگوناح و تاوان دانەنرێن ، نابێ هیچ كەس لەسەر ئەو جۆرە ڕەفتارانە بە تاوانبار دابنرێ و هەر گلەییشی لێ بكرێ چ جای سزا بدرێ ، چونكە پەرلەمان بڕیاری داوە !!

فەرمانبەری بۆکراو لەلایەن گەلەوە کراوە بە بتێک کە لەحیاتی خوا بەندایەتی بۆ دەکرێ و دەپەرسترێ بەهەموو مەعنای وشەی پەرستن !!

چوارەم : ئەمە چەند دەقێک لەوبارەوە کە حوکم و بەرنامەدانان و حەلاڵ کردن و حەرامکردن و ئاراستە ( تَوجیە ) کردنی تاک و کۆمەڵ بەس هەقی خوای پەروەردگارەو تەنیا ئەو زاتە بەرزو مەزن و بێ هاوتایەش شایستەی ئەوەی هەیە :

أ- ( أَفَحُکمَ الجاهلیةِ یَبغون ؟ ومَنْ أحسنُ مِنَ الله حُکماً لِقَومٍ یُوقنون) المائدة / ٥٠ .

ب- ( أمْ لَهُم شرکاءَ شرعوا لَهُم مِنَ الدینِ ما لَمْ یأذن به الله .. ) الشوری / ٢١ .

ج- ( .. إنِ الحُکمُ إلاّ لله أمر ألاّ تعبدوا إلاّ إیاه ذلک الدین القیم ولکن اکثر الناس لایعلمون ) یوسف / ٤٠ .

د- ( ثم جعلناک علی شریعةٍ مِنَ الأمر فاتبعها ولاتتبع أهواء الذین لایعلمون ) الجاثیة / ١٨ .

هـ- فلا وربک لایومنون حتی یحکموک فیما شجر بینهم ثم لایجدوا في أنفسهم حرجاً مما قَضَیْتَ ویُسَلِّموا تَسلیماً ) النساء / ٦٥ .

و- ( .. ومَن لَم یحکُم بما أنزل اللهُ فأولئکَ هُمُ الکافرون ... الظالمون ..... الفاسقون ) المائدة /٤٤ ، ٤٥ ، ٤٧ .

ز- ( عَدِي ) کوڕی حاتەمی طائی دەگێڕێتەوە دەڵێ ڕۆژێکی جووم خزمەت پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام گوێم لێ بوو ئەم ئایەتەی دەخوێند :( إتَّخذوا أحبارَهم ورُهبانَهم أرباباً مِن دونِ الله والمسیح ابن مریم وما أُمِروا إلاّ لِیَعبدوا إلهاً واحداً سبحانه عما یشرکون)[1] التوبة/

(١) واتە : جوولەکەو دیانەکان زاناو ڕاهیبەکانیانیان و مەسیحی کوڕی مەریەمیان لەجیاتی خوا کردنە پەروەردگاری خۆیان ، هەرچەندە فەرمانیشیان پێ کرابوو کە جگە لە یەکخوا کەس نەپەرستن ، پاکی بۆخوا لەوەی دەیکەنە هاوبەشی .

منیش گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا - جولەکەو دیانەکان - زاناو گۆشەنشینەکانی خۆیانیان نەدەپەرست ! فەرمووی : ئایا حەڵاڵیان لێ حەرام نەدەکردن و حەرامیان بۆ حەڵاڵ نەدەکردن و ئەوانیش - واتە خەڵکەکە - شوێنیان نەدەکەوتن ؟! گوتم : با ، فەرمووی : دە ئەوە پەرستنیانە بۆ وان .

کەواتە :

پوختەی قسان ئەوەیە کە ( دیموکراسی ) یش وەک هەموو بەرنامەو رێچکە مرۆڤکردەکانی دیکە خەت و رێبازێکە لەئاقار بەرنامەو رێبازی خواداو ، شێوەیەکە لە شێوەکانی بەڕێوەبردنی ژیان و گوزەران کە زادەی بیرو هۆشی ئینسانەو ، دەیەوێ دوور لە ئاراستەو ڕێ ڕوونی خوا ژیانی ئینسان بەڕێوە ببات ، دیارە هەموو حوکم و پەیڕەوێکیش جگە لەوەی کە لە خوای پەروەردگارەوە بۆ مرۆڤایەتی هاتوە بە حوکمی طاغووت و ڕژێمی نەفامیی ( حُکْمُ الجاهلیة ) لەقەڵەم دەدرێ .

کەوابێ :

هەرکەسێک بڕوا بە دیموکراسی - یان هەر بیردۆزەیەکی دیکەی زادەی مرۆڤ - بێنێ مانای وایە ئەری بەسەر ئیسلامەوە نامێنێ و شایەتمان ( أشهد أن لا إله إلاّ الله وأنّ محمداً رسول الله ) ەکەی هەڵوەشاوەتەوە ،(1) لەبەرئەوەی کە بە قبووڵکردنی دیموکراسی بە بەرنامەی ژیان ، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بڕوا و پابەندی بە هەرکام لە دوو لایەنی بیروباوەڕو بەرنامە ( العقیدة والشریعة ) ی ئیسلام لەبەین دەچن و هەڵدەوەشێنەوە ، چونکە

---

(1) دیارە ئەم حوکمە سەبارەت بە کەسانێکە کە لەڕووی زانیاری و تێگەیشتن و بڕوا پێ بوونێکی هۆشیارانەوە شوێن ئەو بیردۆزانە دەکەون ، نەک لەڕووی سادەیی و شوێن کەوتنی کوێرانەوە .

دیموکراسیو پەرلەمانێک کە لێی پەیدا دەبێ دەبن بە جێگر دار ( بدیل ) ی هەردووکیان ، دیمان هەر دڵ و مێشکێک بەڕاستی سڕوابوون بە خواو پێغەمبەری و بەرنامەکەی تێدا سەقامگیر بووبێ بڕواهێنان بە دیموکراسی ناتوانێ جێگای خۆیان تێدا بکاتەوە .

## چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست بەکورتی

١ـ ئێمە کە دژی دیموکراسیین وەک بەرنامەی ژیان ، وەنەبێ حەز لە چارەی دیکتاتۆریەت بکەین ، بەڵکو وەک پێشتر گوتمان دیموکراسی لە هەموو ڕژێمە مرۆڤکردەکان وێچووترو لەبارترە ، وە بە پێچەوانەی حاڵی بوونی گەلێک کەسەوە جێگار ( بدیل ) ی دیموکراسی بەس دیکتاتۆریەت نیە ، بەڵکو بەرنامەی خوای زاناو کاربەجێیە .

کەواتە ، ئێمە چەندە دژی دیموکراسیین وەک بەدیلی دین ، هەوت هێندەش دژی دیکتاتۆریین کە بەدیلی ڕاوێژ ( شورێ ) یە .

٢ـ ئێمەی مسولمان ڕاوێژ ( شورێ ) مان هەیە کە بەشێکە لە ئیمانمان لەجیاتی پەرلەمان کە بتێکە لەجیاتی خوا دەپەرسترێ .

٣ـ دیموکراسی بەناوی ئازادی یەوە مرۆڤ بەرەڵدا دەکات و ، سنووری عەقڵ و شەرعو سروشتی ( فطرة ) ی پێ دەشکێنێ. واتە لەسایەی دیموکراسیدا ئینسان جگە لە پابەندی ی بە فەرمان و بڕیارەکانی پەرلەمانەوە لە هەموو قەیدو مەرجێکی تر ئازادو سەربەستنە ، بەڵام ئیسلام دەڵێ ئینسان بەندەی خوایە نەک پەرلەمان و پێویستە پابەندی شەرعی خوا بێت و لە جوغزی ئەو بەرنامەیەدا ئازاد بێت ، ئەگەر نا لە ( ئازاد ) دەترازێ و دەبێتە ( بەرەڵدا ) !!

وە لەکۆتاییدا :

## ئایا دروستە مسوڵمان بەشداری پەرلەمان بکات ؟!

سەرەتا ـ پەرلەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە ـ بەپێویستی دەزانم تەمومژی بۆچوون ( تصور ) ێکی هەڵە بڕەوێنینەوە :

کەسانێک کە وەک پێویست لە مەسەلەی ( دیموکراسی ) نەگەیشتوون بە ڕەگ و ڕیشەی دا نەچوونەخوار ، پێیان وایە کە دیموکراسی بەس بریتیە لە ئازادی ی دەربڕینی بیرورا و ، پەرلەمانیش هاو واتا ( مُرادف ) ی ( شوریٰ ) یەو ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ !!

بەڵام لەڕاستیدا وا نیە ، نە دیموکراسی بەس ( حرية التعبير عن الرأي ) یەو ، نە پەرلەمانیش هاو مەعنای ( شوری ) یە ، جارێ دەربارەی مەعناو چەمکی دیموکراسی پێم وایە هێندەمان تویژیوەتەوە حەوجێ بە دووبات کردنەوە ناکات ، بەڵام لەبارەی جیاوازی نێوان پەرلەمانی نائیسلامیو ( شوری ) ی ئیسلامی هەر بەکورتی دەڵێم :

یەکەم : ڕاوێژ ( شوری ) لەئیسلامدا یەکێکە لە یاساو بنچینەو پێکهێنەرەکانی ،(1) بەڵام پەرلەمان هیچ پەیوەندی بەئیسلامەوە نیەو ڕۆڵەو جگەرگۆشەی دیموکراسی یە .

دووەم : جۆرو چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمان و ( شوری ) لێک جیایە ، چونکە ئەو کەسەی کە هەڵدەبژێررێ بۆ ئەندامەتی کۆری ڕاوێژ ( مجلس الشوری ) ی ئیسلامی دەبێ لە شێوازو چۆنیەتی هەڵبژاردنەکەی دا ئاداب و سنوورەکانی شەریعەت ڕەچاو بکرێن ، بەڵام باباى پەرلەمانی بەپێچەوانەوە ئازادو بێ بەندوبارە .

---

(1) بۆ وێنە خوای پەزن فەرموویەتی :( ... والذين استجابوا لربهم واقاموا الصلاة وأمرهم شوری بينهم ومما رزقناهم ينفقون ) . الشوری / ٣٨ . وەکدەبینین ( شوری )لەنێوان نوێژو زەکاتدا هاتوە !

سێیەم : وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە پەرلەمان بەمەبەستی بەرنامە دانان ـ بەمەعنای موتڵەقی ئەم وشەیە ـ هەڵدەبژێررێ ، واتە بەکورتیو بەکوردی ( خوایەتی کردن بەسەر خەڵکدا ) ، بەلاّم کۆڕی ڕاوێژی ئیسلامی ئەرکو کارەکەی لە دوو شتاندا کورت هەڵدێ :

أ ـ چەسپاندنی ئەو حوکمو بڕیارە شەرعیانەی کە دەقەکانی قورئان و سوننەت دەلالەتیان لەسەر دەکەن .

ب ـ ڕوونکردنەوەو هەڵهێنجانی هەندێک یاساو بڕیاری شەرعی کە کۆمەڵگا بۆ ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی پێویستی پێیان هەیە ، لەبەر تیشکی قورئان و سوننەتدا ، ئەم کارەش پێی دەگوترێ کۆشش کردن بۆ هەڵهێنجانی یاساکانی شەرع ، بەکورتی ( الأجتهاد والأستنباط ) .

کەواتە :

ئەرکی پەرلەمان بریتیە لە یاسادانان ( التشریع ) بەبێ پرس کردن بەخواو پێغەمبەرەکەی علیه الصلاة والسلام و بەرنامەی خوا !

بەلاّم ئەرکی کۆڕی ڕاوێژی ئیسلامی بریتیە لە پابەندی ی موو بەموو بە فەرمان و بڕیارەکانی خواو پێغەمبەرەوە ، وە تاقە ( ماف )ێک کە پێی دراوە بریتیە لە ڕوونکردنەوەو هەڵهێنجانی ئەو یاساو بڕیارانەی کە جەماوەر توانای تێگەیشتن و وەرگرتنیانی نیە ، ( ... فاسألوا أهلَ الذكر إن كنتم لاتعلمون ) النحل / ٤٣ .

دیارە هەرکەسێکیش لەخۆی نەگۆڕێ دەزانێ کە یاسادانان(تشریع) لەلایەکەوەو چەسپاندن و ڕوونکردنەوە ( تثبیت و توضیح ) ی یاساکانی شەرع لەلایەکی دیکەوە ، هێندەی هەق و ناهەق لێک دوورن .

جا ئێستا وەلاّمی پرسیاری ( ئایا دروستە موسڵمان بەشداری ی پەرلەمان بکات؟! ) زۆر ئاسان بووە ، بۆیە هەروا بەکورتی دەڵێین :

ئەوەی کە لە باسەکانی پێشوو بۆ پێچەوانە دەفامرێتەوە ئەوەیە کە چوونە نێو پەرلەمان و بەشداری تێداکردنی شتێکی حەرام و قەدەغەیە ، چونکە بەشداری کردنە لە دانانی دین و بەرنامەی ژیان دا ، کە ئەمەش بەس لەخوا دەوەشێتەوەو هەر لەتوانای ئەویش دایە ئەو کارە بکات ، بەڵکو لەمەش خراپتر بەشداری کردن لە پەرلەمان دا بریتیە لە دان پێداهێنانی خوایەتی ( ألوهیة ) ی بتێکی ساختە کە تایبەتی ترین ئەرکی خوایەتی بەسەر خەڵکی دا ئەنجام دەدات کە بەرنامەرێژی و یاساکردنە .

بەڵێ بەراشکاوی و بێ پەردە رای دەگەیەنین کە چوونە نێو پەرلەمان بۆ مرۆڤی مسوڵمان حەرامو قەدەغەیە ، بەڵکو ئەگەر بڕوای بە هەقێتیی و شەرعی بەتی ئەو پەرلەمانە هەبێ - مەگەر چۆن - دەنا فڕی بەسەر ئیسلامەوە نامێنێ و یەکجاری دەچێتە خانەی کوفرەوە .

ئنجا ئەگەر یەکێک بپرسێ : باشە لەهیچ حاڵەتێک دا مسوڵمان هەر بۆی نیە بەشداری پەرلەمان بکات ؟!

لەوەڵامدا دەڵێین :

هەرچەندە لە ئەسڵ دا چوونە نێو پەرلەمان حەرامو قەدەغەیە بەڵام بەپێی یاسای ( الضرورات تبیح المحظورات ) واتە : حاڵەتە ناچاری یەکان حەرام موباح دەکەن ، ئەگەر هاتو بانگەوازکردن و تێگەیاندنی خەڵکی یەکی لەسەر ئەوە کەوت کە لەو پەرلەمانەدا دەنگی ئیسلام هەبێ ، تاکو بەڵگە لەسەر خەڵکی تەواو بکرێ و ،[1] ئەو کۆمەڵە کە بە حیساب هەڵبژاردەی خەڵکەکەن پەیامی ئاشکرا ( البلاغ المبین ) یان بێ رابگات تاکو عوزرو بیانوویان نەمێنێ ، یان ئەگەر هاتو فەرمان بەچاکەو رێگرتن لە خراپە ( الأمر بالمعروف والنهي عن المنکر ) یەکی لەسەر ئەوە کەوت کە لەو

(١) ( لِتَتِمَّ الحُجَّةُ علی الناس )

شوێنەدا کەسانێک هەبن بۆ پشتگیری کردنی شتی هەق و شەرعــی و ناڕەزایی دەربڕین بەرانبەر شتی هەڵەو ناشەرعی ، ئەوە لــەم دوو حاڵەتە هەڵاوێرراو (إستثنائی) ەدا - یان هەر حاڵەتێکــی دیکەی وەکوان - لەبەر ناچاری و پێویستیی چوونە نێو پەرلەمان موباحو دروستە ، بەمەرجێک گومانی زیاتر بەلای ئەوەدا بچێ کــە ئەو بەرژەوەندی و مەبەستانەی بۆیان دەچێتە ئەو شوێنە دێنەدی .

کەواتە :

ئەو موسڵمانەی کە دەچێتە پەرلەمانێکەوە تاکو لەوێدا ئەرکی بانگەوازکردنی خەڵک بۆلای خوا ، یان ئەرکی فەرمان بەچاکــەو رێگرتن لە خراپە ئەنجام بدات ،[1] ئومێد وایە نەک هــەر گوناهبار نەبێ ، بەڵکو بەئەندازەی ئیخلاص و بەرێزی چاکــی ی خێرو پاداشتیشی بۆ بنووسرێ ، بەلام پێویستە بەخەڵکی رابگەیەنێ کە حوکمی ئەو پەرلەمانە لەروانگەی ئیسلامەوە چۆنەو ، ئەویــش بە چ نیازو مەبەستێک دەچێ ، تاکو بەهەڵەدا نەچن و سەریــان لێ نەشێوێ .

وە رەنگە پێویست بە روونکردنەوەو لەسەر رۆیشتنیش نەکات کە پەرلەمان نەک هەر بەدیلی بانگەوازو پەروەردەو تێگەیانــدن و رێکخستن و خەباتی فیکری و سیاسیو چەکداری نیە ، بەڵکو هــەر رێگای سروشتیی وەدەستهێنانی حوکمڕانیش نیەو قەت نابێ موسڵمان بەهیوابن لەرێی پەرلەمانەوە بگەنە کورسی حوکم ، بەڵکو تاقــە رێگای هێنانەدی حوکمی ئیسلامیی بریتیە لە گۆڕینی کۆمەڵگا بەهەموو شێوازو پێداویستیەکانی ئەو کارە هەر لە بانگەوازو تێگەیاندن و

(١) دیارە ئەو کەسانەش کە بەهەمان پاڵنەرو نیازو مەبەست ئــەو جۆرە کەسانە هەڵبژێرن و دەنگیان بۆ بدەن ، هەڵوێستی وانیــش هەمان حوکمی ناوبراوی هەیە .

پەروەردەکردن و ڕێکخستنەوە بگرە .. هەتا دەگاتە دوا قۆناغ و لووتکەی هەرە بەرزی ئەو جیهادو کارە بەرزو پیرۆزە کە جەنگ کردن و خەباتی چەکدارانەیە

# بەشی پێنجەم

# ئیمان چارەی دەردی کورد دەکات نەک پەرلەمان

خوێنەری بەڕێز !

ئەم بەشە ـ کە بەشێکی زۆر گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیەیە ـ لە چوار خاڵان دا دەخەینەڕوو :

یەکەم : ئیمان چی یە ؟! دووەم : ئیمان تاقە بناغەی پتەوی پەیدابوونی یەندایەتی‌و برابوون و ڕاوێژو مەرکەزی بوونی کۆمەڵگایە ، سێیەم : کیان و قەوارەی شەرعیی بەرهەمی مۆگەری ئیمانێکی ڕاست و ساغە ، چوارەم : بۆچی پەرلەمان چارەی دەردی .. کوردی پێ ناکرێ ؟!

## یەکەم : ئیمان ( بڕوا ) چی یە ؟! (١)

ئیمان بریتیە لە جێگیربوون و دامەزرانی خواناسی ( معرفة الله ) و هەموو ئەو مەسەلانەی کە پێیەوە پەیوەستن لە عەقڵ و دڵ دا .

یان :

ئیمان بریتیە لە تێگەیشتن و قەناعەت‌پێهێنان و هەزم کردنی هەموو ئەو ڕاستیيانەی کە خوا سبحانه وتعالى بۆ ( محمد ) صلی

---

(١) لێکۆڵینەوەو توێژینەوە دەربارەی پێناسەکردن و ڕوونکردنەوەی واتاو چەمکی ( ئیمان ) ، ئالقەی پێنجەمی زنجیرەی :( با چاکتر ئیسلام بناسین ! ) ەو چاوەڕێ ی ( چاپ ) ە .

الله علیه وسلم دوایین پێغەمبەری خۆی ناردوون .
وەک تێبینی دەکرێ من لە هیچ کام لەم دوو پێناسەیەی سەرەوەدا باسی کردەوە ( عمل ) م نەکردوە ، دیارە هۆی ئەمەش ئەوە نیە کە پێم وابێ کردەوە بەشێکی ئیمان نیە ، چونکە جەماوەرو زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام رایان وایە کە ( الأیمان هو الأذعان بالجنان والأقرار باللسان والعمل بالأرکان ) واتە : ( بروا ئەناعەت هێنانە بەدڵ و دەروون و دان پێداهێنانە بە زمان و کردەوەیە بە ئەندامەکان ) ، بەڵکو من بۆیە بەپێویستم نەزانی کە لەکاتی پێناسەکردنی ئیمان دا باسی کردەوە بکەم ، چونکە لەراستیدا هیچ کاتێک ناگونجێ بروای راست و ساغ هەبێ و کردەوەی چاک ( العمل الصالح ) ی لەگەڵ نەبێ ، هەربۆیەش مەگەر بەدەگمەن دەنا خوای زاناو کاربەجێ لەهیچ جێیەکی قورئانیدا باسی ( ئیمان ) ی نەکردوە کە بەدوایدا یان لەپێشەوەی باسی کردەوەی چاکی نەکردبێ .
بەڵێ خوێنەری بەرێز !
ئیمان بریتیە لەو حاڵەتە بەرزو پیرۆزە عەقڵی و عاتیفی و کردەوەییەی کە لە ئینسان دا دێتەدی لەسۆنگەی ئەوەوە کە عەقڵ و دەروون و بگرە سەرتاپای وجوودی پڕبەپڕ بووە لە خۆشویستن و بەگەورە گرتن و شەرم و رێزو سام و هەیبەت و گەردن کەچی بۆ خوای بەرزو مەزن و ، ئەناعەتی تەواوو پابەندی ی بەپێی توانای بە بەرنامە - کەیەوە هەیە .
سادەتر بڵێین :
( ئیمان ) واتە : موسڵمانەتییەکی راست و ساغ کە دەروون و دەر ( باطن و ظاهر ) ی ئینسان بگرێتەوە ، هەربۆیەش جاری وا هەیە وشەی ( إیمان ) و ( إسلام ) لە قورئانیدا وەک دوو وشەی

هاو واتا ( مُرادِف ) بەکارهاتوون ، بۆ وێنە : ( فأخرَجْنا مَن کان فیها منَ المؤمنین فما وجدنا فیها غیر بیتٍ منَ المسلمین ) . الذاریات / ٣٥ ، ٣٦ .

وە جاری واش هەیە ئیمان بۆ موسڵمانەتی ڕاستو ساغ بەکارهاتوە ، بەڵام ئیسلام بۆ جۆرە موسڵمانەتییەکی ڕووکەشی و ناتەواو ، بۆ وێنە : ( قالَتِ الأعراب آمنّا ، قل لَمْ تُؤمنوا ولکن قولوا أسلمنا ولَمّا یَدخُل الأیمان في قُلوبِکم ) الحجرات / ١٤ .

کەواتە : کورتەو پوختەی قسان :

ئیمان بریتیە لە قەناعەت هەبوونی بە عەقڵ و دڵ بەڕاستیی و تەواوی ی بەرنامەی خوا ـ کە ئیسلامە ـ و ڕەفتارکردن بەگوێرەی ئەو بەرنامەیە .(١)

وە شایانی باسیشە کە ئیسلام بەرنامەو پەیڕەوێکی تیروتەواوی هەمەلایەنەی ژیان و گوزەرانی تاک و کۆمەڵەو هەڵسوکەوت و چالاکی ـ یەکانی تاک و کۆمەڵ لە هەموو بوارەکانی فیکری و دەروونی و کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووری و .. هتد دا بەشێوەیەک کە لەگەڵ سروشتی ئینسان و ڕەوتی ژیانیو حیکمەتو هۆی خولقێنرانیدا لەسەدا سەد دەگونجێ ، ڕێکدەخات .

پێغەمبەری پێشەواشمان علیه الصلاة والسلام لە یەکێک لە فەرموودە بەرزو پیرۆزەکانیدا لە پێناسەی ( بڕوا ) دا فەرموویەتی :( الأیمان بضع وسبعون ـ أو بضع وستون ـ شعبة ، أفضلها قول لا إلهَ إلاّ الله ، وأدناها إماطة الأذی عن الطریق ، والحیاء شعبة من الأیمان ) متفق علیه . واتە :

---

(١) پێویستە بزانرێ کە مەبەستمان لە وشەی ( ئیمان ) یش کە لەگەڵ وشەی ( پەرلەمان ) دا بەراوردی پێ کراوەو وەک دوو شتی جیاوازو دژبەیەکدانراون ، ئەم جۆرە چەمکو واتا حەقیقیو فراوانەیەتی .

بڕوا حەفتاو ئەوەندە ـ یان شەست و ئەوەندە ـ بەشەیە ، چاك ترینیان گوتنی ـ وشەی ـ ( لا إله إلا الله ) یەو، نزمترینیان لابردنی ئازارێكە لەسەر ڕێگا ، وە شەرم و شكۆش بەشێكە لە ئیمان .

دووەم : ئیمان تاقە بناغەی پتەوی بەندایەتی و برابوون و ڕاوێژو مەركەزی ی بوونی كۆمەڵگایە

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! هەركام لەم چوار خەسڵەتە بەرزو گرنگە بەرهەم و ئەنجامی سروشتیی ئیمانن لە تاك و كۆمەڵی موسڵماندا و بەڕیز ـ ترتیب ـ و بێ بەبێ وێرای گەشەكردن و كامڵ بوونی بڕوا پەیدا دەبن و دەخەملێن .

سەرەتا بەئەندازەی بوون و گەشەكردنی ئیمان لە عەقڵ و دڵی ئینساندا خەسڵەتی بەرزی بەندایەتی ( عبودية ) پێشگەشە دەكاو لە دەرو دەروونیدا قووڵ دەبێتەوەو فراوان دەبێ .

مەبەستیش لە بەندایەتی وەكو زانایانی ئیسلام و بەتایبەتی ( إبن تيمية ) فەرموویانە : هەبوونی ئەوپەڕی ڕێزو سام و خۆشەویستیی و گەردن كەچییە بەرانبەر بەخوا سبحانه وتعالى .

ئنجا برایەتی ( الأخوة ) پێشئەنجام و بەرهەمی مەنتیقیی و سروشتیی خەسڵەتی یەكەمە ، چونكە هەركاتێك ئینسان ( تاك )ە خوای پەروەردگاری و بەرنامەكەی بەشێوەیەكی ڕاست و ساغ ناسین و لە بەرانبەریاندا دڵسۆزو گەردن كەچ بوو، هەموو ئەو ئینسانان ( كۆمەڵ ) ەی كە لەو خەسڵەتەدا لەگەڵی یەكدەگرنەوە خۆشی دەوێن و لەئەنجامی ئەمەشدا برایەتی لەسەر بنچینەی مەحكەم و نەلەقاوی بەندایەتی بۆخوا ( العبودية لله ) پێكەوە جۆش دەدرێ و ، وەكدیوارێكی بە قورقوشم داڕێژراوی لێ بەسەردێ ( كأنهم بنيان مرصوص )

ئنجا بێگومان شتێکی سروشتیو چاوەڕوان کراوە کە کۆمەڵکایەکی ئاوا ـ خاوەن یەکبەرنامەو ئامانجو پێکەوە براو تەبا ـ بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارییان و چارەکردنی گیروگرفتەکانیان پرس وڕایان بەیەکتر دەبێو ڕاوێژ ( مشورة ) بەیەکتر دەکەن و ، بەم شێوەیە خەسڵەتی هەرە بەرزو گرنگی ڕاوێژ ( شورى ) بەشدەرەخسێو فراژوو دەبێ .

خوای بەرزو مەزن و کاربەجێش لە یەکێک لە سوورەتە بەپێزەکانی قورئان دا کە هەر سوورەتی ( شورى ) شی پێ دەگوترێ لە ئایەتی (٣٨) دا هەرکام لەم سێ خەسڵەتە بەرزو گرنگەی باسمان کردن ( بەندایەتیو برایەتیو ڕاوێژ ) پێکەوە باسی کردوون :

( والذين استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة وأمرهم شورى بينهم ومما رزقناهم ينفقون ) واتە : وە ئەوانەی بەدەم بانگی پەروەردگاریانەوە چوون ، وە نوێژیان بەرپا کردو کاروباری خۆیانیان بەڕێوە دەبەن و لەوەی پێمان داون دەبەخشن .

استجابوا لربهم : ئیمان ( چونکە ئەسڵ و بناغەی ئیمان خواناسیو بەدەنگەوە چوونیو مل بۆ کەچ کردنیەتی ) .

أقاموا الصلاة : بەندایەتی ( چونکە نوێژ چاکترین و تەواوترین و کۆکەرەوە " جامع " ترین شێوەی بەندایەتییە ) .

أمرهم شورى بينهم : ڕاوێژ ( " أمر " وشەیەکی گشتییە هەموو ئەو کاروبارە گرنگانە دەگرێتەوە کە حەوجێی ڕاوێژن ) .

مما رزقناهم ينفقون : برایەتی ( چونکە کاکڵی برایەتی بەتەنگ یەکترەوە بوون و هاوکاری و کۆمەکی یەکتر کردنە ) .

وە لەکۆتاییدا کۆمەڵگایەکی بۆخوا بەندەو پێکەوە براو لەگەڵ یەکتر بەراوێژو پرس و ڕا هەم بە حوکمی عەقڵ و واقیعو هەم بە حوکمی ئیمان و بەرنامەکەیان هەوڵ دەدات کە چەق و مەرکەزییەتێکی ڕاست و دروستی تێدا بێ ، تا بتوانێ بەئاسانی کاروبارەکانی بەڕێوە ببات .

هەڵبەتە دەقی قورئان و سوننەتیش- بێجگە لە بەڵگە شەرعییەکانی دیکە - دەربارەی پێویستیی هەبوونی چەق و مەرکەزییەتێک لە کۆمەڵگای موسڵمانان دا زۆرو زەوەندن و، ئەم مەسەلەیە یەکێکە لە باساو درووشمە هەرە زەق و ئاشکرایەکانی ئیسلام کە موسڵمانان قەت نابێ سەرکردەو براگەورەو پێشەوا بن ، بۆیە بەپێویستی نازانم زۆر خۆم بەم باسەوە خەریک بکەم و بە ئستنەرووی دوو دەقی قورئان و سوننەت- وەک نموونە - وازی لێ دێنم ، خوای زاناو کاربەجێ فەرموویەتی :( یا أیها الذین آمنوا اطیعوا الله واطیعوا الرسول وأولی الأمر منکم ..) النساء / ٥٩.
واتە : ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە فەرمانبەری خواو فەرمانبەری پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - و کاربەدەستانێک بکەن کە لەخۆتانن ..

پێغەمبەری سەروەریشمان فەرموویەتی :( إذا خرج ثلاثة في سفر فلیؤمروا أحدهم ) رواه أبوداوود . واتە :
ئەگەر سێ کەس بەسەفەر چوون با یەکێکیان بکەنە فەرماندەیان .
ئنجا خوێنەری سەنگین !

ئێستاش کە زانیمان ئیمان چییە ؟ وە ڕوونمان کردەوە کە چۆن (ئیمان )[1] تاقە بناغەی پتەوی بەندایەتی بۆخواکردن و پێکەوە

---

(١) پێویستە بزانرێ کە هەموو جارێ مەبەستمان لە ئیمان ، ئیمانێکی

براو تەبا بوون و، پرس و راوێژ بەیەکتر کردن و هەبوونی چەق و مەرکەزییەتێکی راست و دروستە لەنێو کۆمەڵگادا ، کاتێ ئەوە هاتوە کە بچینە سەر خاڵی سێیەمی ئەم بەشە .

سێیەم : کیان و قەوارەی شەرعیی بەرهەم و ئەنجامی سۆگەری ئیمانە[1]

بەڵێ خوێنەری بەرێز !

( ئیمان ) یەک کە لە خاڵی یەکەمدا بەکورتیی و سادەیی پێناسەمان کردو، لە خاڵی دووەمدا زۆر بەگوشراوی و کورتی پەرێـــــــــزو شوێنەواریمان لە ژیانی کۆمەڵگادا خستەروو، هەرکاتێک وەک پێویست لە دڵ و مێشکی گەل و کۆمەڵێکدا ریشە دابکوتێ و بخەمڵــــــێ ، پەیدابوونی کیان و قەوارەو بوونێکی راستەقینە ئەنجــــــام و بەرهەمێکی سۆگەرو سروشتییەتی لەنێو ئەو گەل و کۆمەڵـــــەدا ، چونکە :

١- ئەمە حەقیقەتێکی مێژوویی و تەجرەبەکراو و سەلمێنراوە لە مێژووی هەموو ئەو گەلانەدا کە بەو شێوەیە لەگەڵ ئیمان و ئیســـــلام دا رەفتاریان کردوە ، بۆ وێنە : عارەبەکان ، فارسەکان ، سەلجووقی ـ یەکان ، عوسمانییەکان ، ئەییوبییەکان ..هتدەوە ( لە مێــژووی نوێشمان دا ئێرانیی و ئەفغانییەکان ) .

٢- سروشتی عەقیدەیی و بەرنامەیی ئەو ئیمان و ئیسلامە وایە کە رێگا

---

........................................................................

(١) ـ راستەقینەیە ، بۆیە هەندێک جار پێشدەڵێین ( ئیمانێکی راســـت و ساغ ) نەک ئەوەی خەڵک پێیان وایە ئیمانە بەڵام شتێکی زۆر بۆش و بێ نێوەرۆکەو هیچ بەرێزو شوێنەوارێکی وای لە ژیان و گوزەرانـــی هەڵگرانیدا نیە کە بوونی خۆی پێ ئیسپات بکات !!

بە شوێن کەوتوو و پەیڕەوانی ئاداتگرو کەساس و بێ دەسەڵات و داماو بن و . لێیان داوا دەکات کە خاوەنی هێزو پێزو عیززەت و دەسەڵات بن ( وأعدوا لهم ما استطعتم من قوة ...) الأنفال / ٦٠ . ( لاتَظلِمون ولاتُظلَمون ) البقرة / ٢٧٩ . واتە : زوڵم مەکەن و مەیەڵن زوڵمیشتان لێ بکرێ ، ( ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين ) المنافقون / ٨ . دەجا دیارە کە پەیدابوونی هێزو پێزو دەسەڵات و عیززەتیش بەبێ هەبوونی کیان و قەوارە شتێکی مەحاڵ و خەیاڵ پڵاوە .

٢- وە گەل و کۆمەڵێکیش هەڵگرو خاوەنی ئەو جۆرە ئیمانە بن بڕست و توانای هێنانەدی ئەو مەبەستە بەرزو پیرۆزەیان دەبێ ، کە وێڕای پێویستبوونی بۆ بەڕێوەچوونی ژیان و گوزەرانیان . ئیمانەکەیان وەک ئەرک ( وظيفة ) یێکیش لێیان داوا دەکات ، چونکە گەورەترین و سەرەکی ترین هۆی تێشکان و شکستی گەلان لە بەرانبەر ناحەزان و چەوسێنەرانیان دا یەکدڵ و ڕەنگ و دەنگ و سەنگ نەبوونیانە ، بەڵام لە سایەی ئیمان دا ئەم کیروگرفتە بە چاکترین شێوە چارەسەر دەکرێ ، وەک لە خاڵی دووەمدا شتێکمان لەوبارەوە باسکرد ، خوای تەعالەجێو زاناشمان فەرموویەتی :( وأنتم الأعلون إن كنتم مؤمنين ) آل عمران / ١٣٩ . دیارە بەرزی ( عُلُوّ ) یش بەبێ ئازادی و سەربەخۆیی و هەبوونی کیان و قەوارەی ڕاستەقینە نایەتەدی .

ئێستاش لەبەرئەوەی زۆربەی خەڵکی گومان و دوودڵییان هەیە سەبارەتبەوە کە ئایا ئیسلام دەتوانێ چارەسەری کێشەی کورد بکاتیان نا ؟! بەپێویستی دەزانم توڵە باسێک لەوبارەوە بنووسم :

# چارەسەری کێشەی کورد لە ڕوانگەی ئیسلامەوە چۆنە ؟!(١)

خوای بەرز فەرموویەتی :( وما اختلفتم فیه من شیئ فحکمه إلی الله .. ) الشوری / ١٠ . وە فەرموویەتی :( فأن تنازعتم في شئ فردوه إلى الله والرسول إن كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر ذلك خير وأحسن تأويلا ) النساء / ٥٩ . کەواتە با لەبەر تیشکی چەند بنچینەیەکی هەڵهێنجراو لە کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی دا صلى الله عليه وسلم سەرنجی ئەم مەسەلەیەو چۆنیەتی چارەسەرکردنی بدەین :

خوای بەرزو پاکلە سوورەتی ( الحجرات ) دا فەرموویەتی :
( یا أیها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا إن أكرمكم عند الله أتقاكم إن الله عليم خبير ) . واتە :
( ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەک دروست کردوەو گێڕاومانن بەچەند گەل و تیرەیەک تاکو یەکتر بناسن ، بەڕێز ـ ترینیشتان لەلای خوا پارێزکارترتانە ، بێگومان خوا زاناو شارەزایە ) . دەتوانین چەند بنچینە ( قاعدة ) یەکی سەرەکی لەم ئایەتە هەڵهێنجین :

---

(١) ئەم باسە خاڵی پێنجەمو کۆتایی دەقی ئەو ( محاضرة ) یەیە کە پێشتر باسمان کرد ، بۆیەش حەزم کرد لێرەدا بینووسم تاکو بزانرێ کە ئێمەی ئیسلامی هەر قسەیەک بەڕاست و هەقی بزانین ئامادەین لە هەموو جێیەک بیکەین و بەهەموو دنیای ڕابگەیەنین ، چونکە وەک پێشتر باسکرا ژمارەیەکی زۆر لە نوێنەری ڕۆژنامەو گۆڤارە ئیسلامیەکانی جیهانی ئیسلامی لەو کۆڕە ڕۆژنامەیی ( ندوة صحفية ) یەدا ئامادەبوون کە ئەم ( محاضرة ) یەی تێدا درا .

یەکەم : خەڵک لە ئەسڵی دروستبوونیان دا وەک یەکن ، چونکە هەموویان دروستکراوو بەندەی یەک پەروەردگارن بەبێ ئیمتیازو جیاوازی ، ئەمە لە ڕووی دروستبوون و پەیدابوونیانەوە ، لە ڕووی گەشەکردنیشیانەوە لە نێرو مێ یەک کەوتوونەوە ، کەواتە لە یەک پلە دان و یەک ڕەچەڵەکیان هەیە .
دووەم : وە خەڵک بەپێی ویستی خوای بەرزو بێ هاوتا بەشێوەی چەند گەل و تیرەیەک لەسەر زەوی دابەش بوو ون ، کەوابێ ئەوە کە عارەب عارەب و تورک تورک و کورد کوردە هەروا گەلانی دیکەش ، بەڵێ ئەوە بەس بە ویستی خوای گەورە بووە ، مادام وابێ لەم لایەنەشەوە هیچ ئیمتیازو جیاوازی یان لەنێوان دا نیەو هەموویان لە ( گەل ) یتی و نەتەوەبوونیان دا یەکسانن و ، ڕەنگ و زمان و تایبەتمەندی یە نەتەوەیی یەکانی دیکەش ناگونجێ بکرێنە پارسەنگی بەرزی و نزمی ، بەڵکو ئەم جیاوازی و تایبەتمەندی یانە چەند دیمەنێکن لە نیشانەکانی خوایەتی خوا ، وەک فەرموویەتی :( ومِن آياته خَلْقُ السموات والأرض واختلاف أَلْسِنَتِكم وألوانِكم إنّ في ذلك لآيات للعالِمين ) الروم / ٢٢ . واتە : ( وە لە نیشانە - و بەڵگە - کانی بوونی ئەو ، دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمان و ڕەنگتانە ، بێگومان لەوەدا نیشانە هەن بۆ زانایان ) .
سێ یەم : تەرازووی ڕێزو حورمەت و پێوەری چاکی و خراپی لەلای خوای بەرز ، بەس پارێزکاری ( تقوی ) یە کە هەموو خەسڵەتە پەسندەکان کۆدەکاتەوە ، کەواتە هەرکەسێک لافی بەرزی ی و ئیمتیاز لێ بدات بۆخۆی یان بنەماڵەکەی یان گەلەکەی ، بەسەر یەکێکی دیکەدا بە بەڵگەی - بەرزی ی و پەسندی ی - ئەسڵی دروستبوونی یان پێگەیشتنی ( واتە توخم و ڕەگەزی یان بنەماڵەو ڕەچەڵەکی) ئەوە

بەهەڵەدا چووە . هەروەها هەرکەسێک بیەوێ بوونی تیرەیەک یان گەلێک یان یەکێک لە تایبەتمەندی یەکانیان نەهێڵێ . ئەوە دژو پێچەوانەی ویستو بڕیاری سروشتیی و شەرعیی خوای بەرزو مەزن جووڵاوەتەوە . لەبەرئەوەی ئەوەی کە خوا ویستوویەتی ئەو گەل و کۆمەڵە بەو تایبەتمەندی یانەوە بێ و ئەویش هەوڵی لەبەین بردنی دەدات !

هەروەها هەرکەسێک بیەوێ نیری ستەمو زۆر بخاتە ملی خەڵک چ لەسەر ئاستی تاک و چ لەسەر ئاستی کۆمەڵ . ئەوە بەم ڕەفتارەی دژی حیکمەتی خوا دەجووڵێتەوە کە خەڵکی گێڕاوە بە چەند گەل و تیرەیەک بەمەبەستی یەکترناسین و دۆستایەتی پێکەوەبەستن .

وە هەرکەسێک شانازی بە ڕەگەزو ڕەچەڵەکەوە بکات یان لافی پلەو ئیمتیازێک بەسەر خەڵکدا لێ بدات . ئەوە تەرازووی خوای فڕێ داوەو تەرازووی نەفامیی بەدەستەوە گرتوە . برایەتی ئیسلامی واز لێ هێناوەو لەگەڵ شەپۆلی ڕەگەزپەرستیو دەمارگیری دا ڕەپێچەکدراوە . هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :( لیس مِنّا مَن دعا إلی عصبیة ولیس منا مَن قاتل علی عصبیة ولیس منا مَنْ مات علی عصبیة ) رواه أبوداوود عن جبیر بن مطعم .

دیارە دەمارگیریش ئەوە نیە ـ وەک هەندێک پێیان وایە ـ کە گەلی خۆتت خۆش بوێ و بەپێی توانا خێرو چاکەیان بۆ بڕەخسێنی ، چونکە پێغەمبەری بەڕێز فەرموویەتی :( خیرکم المدافع عن عشیرته مالم یَأثَمْ ) رواه أبوداوود . بەڵکو ڕەگەزپەرستیو دەمارگیری ئەوەیە کە لەسەر ستەمو خراپە لەگەڵ گەل و کۆمەڵەکەتدا هاوکاری بکەی . وەک پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی :( أن تُعین قومک علی الظلم ) رواه أبوداوود . لە وەڵامی کەسێک کە لێی پرسی

( يا رسول الله ما العصبية ؟! ) .[1]

جا لەبەر تیشکی ئەم بنچینانەدا دەتوانین بڵێین : چارەسەری کێشەی کورد ـ لەڕوانگەی ئیسلامەوە ـ ئەوەیە کە :

(( ئەو گەلە ستەم لێکراوە ئەو مافانەی دەستگیر بن کە بوونی نەتەوەیی بانی بێوە بەندەو بەبێ ئەو مافانە ئەو ( گەل ) ێتی ( شعبیة ) بەی کە خوا بۆ ویش و بۆ هەموو گەلانی دیکەش بە ڕاشکاوترین شێوە بڕیاری داوە نایەتەدی )) .

بەڵام لێرەدا تێبینییەکم ماوە پێویستە باس بکرێ :

من وەک مسوڵمانێک بڕوا ناکەم کە کێشەی کورد بەشێوەیەکی ڕاست و ریشەیی چارەسەر بکرێ بەبێ جێبەجێکردنی بەرنامەی خوا ، بەڵێ من پێم وا نیە کە ئازارو مەینەتی گەلی کورد بەس بە دروست بوونی کیانێکی نەتەوەییو دەوڵەتێکی سەربەخۆ، لابچێ ، بەڵگەش ئەوەیە کە بۆ وێنە گەلی عارەب دەبینین چەندان دەوڵەت ـ ئەک بەک ـ ی دەست کەوتوە ، بەلام لەسۆنگەی ئەوەوە کە بەرنامەی خوا لە واقیعی ژیانی دا کاری پێ ناکرێ کۆمەڵگاکانی عارەب دەبینین ئازارو مەینەتی زۆری گرجووبڕ ئابڵووقەی داون .

ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە هێنانەدی مافە ڕەوایەکانی گەلی کوردو هەر گەلێکی دیکەش بەشێوەیەکی حەتمی یەکی لەسەر هاتنەکایەی دەوڵەتێکی نەتەوەیی نەکەوتوە ، بەڵگەی ئەمەش وەک پێشتر ڕابرد ئەوەیە کە کاتی خۆی گەلی کوردو گەلانی دیکەش لەژێر سێبەری دەوڵەتی ئیسلامیدا هەموو مافێکیان دابین کرابوو، وە لە هەندێک حاڵەتی دەگمەن و ناوازەدا نەبێ ستەم و

---

(١) لێرەدا چەند وشەیەکم دەستکاری کردن ، بۆ زیاتر شارەزابوونیش سەرنجی کتێبی ( سۆزی نەتەوایەتی ) بدە .

بێ دادی زەق و ناتۆلا دەرنەکەوتوە ، ئەویش بەهۆی لادانی بێ تامی دەوڵەت لە ڕێبازی دادگەرانەی ئیسلام .

دیارە هەربۆیەش ڕۆژێک لە ڕۆژان گەلی کوردیش وەک گەلـــــــە ئیسلامیەکانی دیکە بیری لەوە نەکردۆتەوە کە لە دەوڵەتی ئیسلامی جیا بێتەوەو قەوارەیەکی سەربەخۆ پێکەوە بنێ . هەڵبەتە حاڵەتـــە ڕیزپەڕەکانیش تیا سیان لەسەر ناکرێ ، بەڵام پاش ئەوەی تورکــــــە طۆرانیەکان وازیان لە پەیوەندی ی ئیسلامەتی هێنا و پەیوەنـــدی ی نەتەوایەتیان لەجێگادا دانا ، وە ئالای برایەتیی ئیسلامی بــــان فڕێ دا و بە ئالای تورکایەتیان گۆڕی یەوە ، کوردو گەلـــــــە ئیسلامیەکانی دیکەش دەستیان کرد بە بیرکردنەوە دەربارەی خۆیان ، هەر بۆیەش ( محمد أمين زكي بگ ) مێژووزانی بەناوبانگی کـــورد لە سەرەتای کتێبەکەی ( کوردو کوردستان ) دا گوتوویەتی :

( لەدوای ئەمە کە لە جێگەی تعبیری عمومی ( عثمانی ) لفظـــــی ( تورک ) و ( تۆرانی ) لە تورکیا باوی سەند ، بە طبیعت وەکـــو افرادی ملتەکانی تر ، منیش لەناو ئەو کۆمەڵەدا غیرەتیی خـــۆم چاکتر چێ کرد .... ) .

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر نەگونجاو هەڵنەسوورا کــــــــە دەوڵەتێکی ئیسلامیی فراوانی وا پێک بێ کە هەموو گەلــــــــە ئیسلامیەکان بگرێتەوە ، هیچ سەغڵەتیو بێ شەرمیەکی تێــــــدا نابینم کە گەلی کوردو غەیری کوردیش ـ ئەگەر توانی ـ دەوڵەتێکی ئیسلامی لەسەر نیشتمانی خۆی پێک بهێنێ ، پاشان ئەو دەوڵەتانـــە لەنێو خۆیان دا هاوکاری بکەن بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامـــی ی گەورە ، ئەو دەوڵەتەی کە بەهۆی ڕووخانی خەلافەتی عوسمانیەوە (۱)

---

(۱) دیارە ئێمە ڕەخنەو تێبینیمان لەسەر حوکم و خەلافەتی ئیسلامیانەی عوسمانیەکان و ئەوانەی پێش وانیش هەن ، بەڵام هەرچۆنێکی بێ ئەو دەوڵەت و خەلافەتە قەڵاو پەرژینێکی مەحکەمی ئیسلام و گەلانی ئیسلامی بوو ، بە نەمانی هەموو لایەک زیانمان لێ کەوت .

لەدەستمان چوو و لە ئەنجامی ئەوەشدا ئەو هەموو بەڵاو مەینەتی ـ یانەمان بەسەردا هەڵرژان کە هەموومان تاڵاویان دەچێژین ..

خوێنەری بەڕێز !

ئێستا کە تا ئەندازەیەک روون بۆوە چۆن ئیمان چارەی دەردی کورد دەکات و کێشەی ئاڵۆزو لەمێژینەی بێ کیانیو ئەوارەیی چارەسەر دەکات ، با هەروا بەکورتی و سەرپێ یی ئاماژە بە دەستەپاچەییو داماوی ی ( پەرلەمان ) یش بکەین لەئاقار چارەسەرکردنی مەسەلەی ناوبراودا

# بۆچی پەرلەمان چارەی دەردی کوردی پێ ناکرێ ؟!

لە چوار خاڵدا وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەینەوە بەڵام زۆر بەکورتی :

یەکەم : چونکە وەک پێشتر گوتمان ( پەرلەمان ) یەکێکە لە رژێمی دیموکراسییەوە هەڵدەقوڵێ بەلەبەرچاو نەگرتنی بوونی خوایەکی پەروەردگارو پێغەمبەرێکی سەروەرو رێ پیشاندەرو بەرنامەیەکی تێروتەواوی خودایی ، چارێ ناچارە ببێتە خوایەکی ساختەو خوایەتی بەسەر خەڵکیدا بکاتو بەرنامەی ژیانیان بۆ دیاری بکات ، ئنجا وەکلە بەشی چوارەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەشدا روونمان کردەوە ئینسان ـ چ تاک چ کۆمەڵ ـ لەبەرئەوەی بۆ بەندایەتی کردن و ناقیکرانەوەو جێگرایەتی خوا دروستکراوە ، نەک بۆ خوایەتی کردن ، ناتوانێ بەرنامەی ژیانی خۆی دابنێو ، ئەگەر کارێکی واشی کرد دووچاری زینتالێو بەدحاڵی دەبێو کارەکەی بێ خێرو نەزۆک دەردەچێ ، وەک ئێستا ئەم راستییە زۆر بە درەوشاوەیی لە واقیعی دەوڵەتو کۆمەڵگاکانی ئەم رۆژگارەدا دەبینین .

دووەم : چونکە گەلی ئێمە چەندە هۆکارە دەرەکییەکان بوونەتە بەرچو لەمبەری سەر ریگای رزگاربوونیو وەدەستهێنانی مافە رەواکانی، حەوت هێندەش هۆکارە زاتییەکان دەوری گرنگ و کاریگەریان هەبوەو هەیە ، دەجا پەرلەمان و بابی پەرلەمانیش توانای گۆرینی ئەو واقیعە دەروونیو زاتییەی ئێمەی نیەو، بگرە بەپێچەوانەوە وەک تەجرەبەی سەرنەکەوتووی ( بەرە ) سەلماندی رەنگەو زۆریش نزیکە کە پەرلەمانیش دیسان ببێتە هۆی زیادبوون و گەشەکردنی ئەو خەسلەتە بەدو هۆکارە دەروونیو زاتییانەی کە گەورەترین هۆی بێ ئاکامبوون و بەئەنجامنەگەیشتنی هەولٌ و کۆششی جوولانەوەی رزگاریخوازیمان بوو ون ، بەتایبەتی لە ئاستی سەرکردایەتی دا ، چونکە کەموکووری و عەیبەکانی سەرکردایەتی راستەوخۆ کاردەکەنە سەر هەموو بەشەکانی دیکەی گەل و شۆرش وەک ئێستا بەزەقی دەبینرێ !!

سێ یەم : لەبەرئەوەی گەلی ئێمە گەلێکی موسلٌمان و خاوەن بروایەو، تەنانەت سەرانی هەموو ئەو رێکخراوو تاقمانەش کە وەک بەرنامە بروایان بەئیسلام نیە ، دانیان بەم راستییەدا هێناوە ، دەجا دەلٌێین : ئەو پەرلەمانەی کە لەنێو گەلێکی موسلٌمان و بروادارد ا دروست دەبێ بێ ئەوەی حیسابێک بۆ ئیمان و ئیسلام و قورئان و شەرعی ئەو خەلٌکە بکات ، مانای وایە پەرلەمانێکی غەیرە شەرعی و ناواقیعییەو تەعبیر لە ناوو بیروباوەری ئەو خەلٌک و گەلە ناداتەوە ، چونکە وەک لە بەشی چوارەمی ئەم لێکۆلٌینەوەیەدا گوتمان ئەو کۆرو ئەنجوومەنەی کە لەنێو گەلێکی موسلٌمان و بروادارد ا پێکدێ ، پێویستە لەسەر بنچینەی ئایین و بەرنامەی خوا دابمەزرێ و ، ئەرکەکەشی کاریپێکردنی شەرعی خوا بێت نەک دانانی شەرعو حەلاٌل کردن و حەرامکردن ، کە ئەمە تەنیا مافی خوای پەروەردگارە .

حا بێگومان پەرلەمانێکی ئاواش بە پەرلەمانی خەڵک و گەل دانانرێ و، خەڵکی موسڵمان ناتوانن ئەو کۆڕو پەرلەمانە بە ئی خۆیان بزانن کە هیچ ڕێزێک لە موسڵمانەتیو خواپەرستییەکەیان ناگرێ و، بگرە هەر هیچ حیسابێ بۆ ئەو خوا بەرزو مەزنو پێغەمبەرە پێشەوایەش ناکات کە ئەو خەڵکە موسڵمانە ئەوان و قورئان و سوننەت و بەرنامەکەیانیان لە هەموو شتێک لەلا گەورەترو بەڕێزترو خۆشەویستترەو، بە هیچ شتێکیان ناگۆڕنەوە ، ـ دیارە هەرکەسێکیش ئاوا نەبێ بە موسڵمان و بڕوادار لەقەڵەم نادرێ ـ .

چوارەم : ئێمە وەک گەلێکی بەشبەشکراوو مافلێ زەوتکراو گلەییو گازندەی زۆر لە ئیمپریالیزمی جیهانیو نەخشەو پیلانە گڵاوەکانی دەکەین کە نیشتمانەکەمانی کردۆتە پێنج پارچەو هەر پارچەی کردۆتە پاشکۆی دەوڵەتێک و ، بەو شێوەیە وشەی کوردستانی لەسەر نەخشەی سیاسی جیهان سڕیوەتەوە .[1] بەڵام ئایا نابێ گلەیی و سەرکۆنەی خۆشمان بکەین کە ئێمەش بە لاساکردنەوەو شوێن کەوتنی ئەو ڕێچکەو بیردۆزە جۆراوجۆرانەی کە هەر لە دڵی پڕ لە بوغزو قەرەزو مێشکی پڕ فێڵ و تەڵەکەی ئەو ئیمپریالیزمو دوژمنە نەگریسەوە سەریان هەڵداوە کە نیشتمانەکەی لێ پارچە پارچە کردووین ، نەک هەموو خەڵکی کوردستان بەڵکو بەس خەڵکی یەکێک لەو پێنج پارچانە ـ کە بەشە کوردستانی سەر بە عێراقە ـ مان کردۆتە زیاتر لە ( ١٠ ) بەش؟!!

---

(١) لە یەکێک لەو کۆڕانەدا کە لە یەکێک لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا بەسترا و منیش بەشداری بووم، کاتێک داوام لێ کرا خۆم بناسێنم و گوتم: خەڵکی کوردستانم ! زۆربەی کۆڕەکە بەسەرسووڕمانەوە گوتیان تا ئێستا ناوی وڵاتی کوردستانمان نەبیستوە ، ئایا کوردستان لەکوێیە ؟! بەزەردەخەنەوە پێم گوتن : لە عیراق بە نیشتمانی ئێمە دەڵێن ( شمال ) و لە ئێران دەڵێن ( غرب کشور ) و لە تورکیاش پێی دەڵێن ( خوارووی وڵات ) و وە هەروەها ...

ئایا دەگونجێ بڵێین ڕەفتاری ئیمپریالیزم خراپ بووە کە هەموو کوردستانی کردۆتە پێنج کوت ، بەڵام ئێ ئێمە هیچ عەیبی نیە ، کە هەر بەنێکمان کردۆتە دە بەش؟! دیارە نەخێر مەگەر بڵێین پەندی ( بانێکەو دوو هەوایە ) شتێکی ڕاستو بەجێ یە !!

کورتەی قسان :

ئێمە کوشتەی دەستی نەخشەو پیلانە گڵاوەکانی ئیمپریالیزمی جیهانین و ، نەخشەو پیلانەکانی ئیمپریالیزمیش بە ڕێچکەو بیردۆزە ـ کانی ئیمپریالیزم بەرهەڵستییان ناکرێ و هەڵناوەشێنرێنەوە ، چونکە هەر شتێک بەدزی خۆی چارەسەر دەکرێ و ، دوژمنی ڕاستەقینەی ئیمپریالیزمی جیهانیو نەخشەو پیلانەکانیشی بەسەربەرنامە تەجرەبە ـ کراوەکەی خوای پەروەردگارمانە ، هەر بۆیەش ئیمپریالیزمی جیهانیو ناحەزانیشمان لە هەموو شتێک زیاتر لێی دەترسن و ڕقیان لێ یەتی !!

ئیدی بە ئومێدی خۆگۆڕین و هاتنەوە سەرخۆو پەند لە ڕابردوو وەرگرتن و ، بە هیوای ئەوەی کە بتوانین بە هەوڵ و هیممەتی هەموو لایەک ـ دوای یارمەتی خوا ـ ڕووحی بەهێزو پیرۆزی ئیمان و ئیسلام بەبەر گەلەکەماندا بکەینەوەو زیندوو ببینەوەو ، بەهۆی دەرزی و دەزووی ئیمان و ئیسلامەوە پێنج پارچەکانی نیشتمانی لێکدابڕاوو چل پەنجا کوتو بەشەی گەلی جنراومان پێکەوە بدرووینەوەو لەسەر بنچینەی پتەوی ئیمان بەهۆی بەندایەتیو برایەتیو ڕاوێـــــــــــــــــــزو پێشڕەوایەتییەکی ڕاستو دروستەوە ، پێکەوەی جۆش بدەینەوە ، چونکە هەر ئەمەیە تاقە ڕێبازی ڕاستەقینەی ژیانی ئێمەو تێکڕای گەلان و هەر ئەمەشە چارەسەرو دەرمانی دەردمان .

خوێنەری بەڕێز !

ئێستاش بەرلەوەی کۆتایی بەم بەشی پێنجەمە بێنین بە پێویستـ

دەزانم سەرنجت بۆ دوو مەسەلەی گرنگ ڕابکێشم کە پەیوەندی یەکی پتەویان بەم بەشەوە هەیە :

یەکەم : ئیمان کۆسپەکانی سەر ڕێگای خەباتی ڕزگاریخوازیمان لادەبات :

ئەگەر لەیادت بێت لە بەشی دووەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا لەژێر سەرباسی ( هۆی بەفامانچ نەگەیشتنی شۆڕش و ڕاپەرینە ڕزگاریخوازەکانی کورد ) دا ئەم پێنج هۆیانەمان بە گەورەترین و سەرەکی ترین کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێ ی کاروانی خەباتی ڕزگاری خوازی گەلی کورد دانا :

١- یەک نەبوون و دژایەتی نێوخۆ .

٢- پشت بەخۆنەبەستن و لەسەر لاقی خۆ نەوەستان .

٣- خۆش باوەڕی و فریوخواردن بە گفت و بەڵێنی هەندەران .

٤- کەم یان بێ ئیخلاصیو ساغ نەبوونەوە بۆ مەبەست .

٥- ڕێگانەدانی سیاسەتی ئیمپریالیزمی جیهانی .

جا ئێستا با هەر وا بەکورتی سەرنج بدەین داخوا چۆن بەهۆی ئیمان و ئیخلاصەوە هەرکام لەم کۆسپ و تەگەرانە لادەچن و ڕێگای بەمرادگەیشتن لەبەردەممان ئاچووغو تەخت دەبێ :

جا ڕێ سەبارەت بە هۆی یەکەم کە لە هەموو کۆسپ و پەرچەکان بێترەزاترو بەزەڕتر بووە، لە سایەی ( ئیمان ) ەوە وەک چڵکێ بەفرێک لەبەر گەرمایی خۆردا ، بە تیشکی ڕۆژی یەندایەتی و برایەتی هەر زوو دەتوێتەوەو ئاوەو ئاو دەچێ .

ئیمانێک کە بە شوێن کەوتووانی دەڵێ :( واعتصموا بحبل الله جميعا ولاتفرقوا .. ) آل عمران/ ١٠٣ .

وە پێیان دەڵێ :( ولاتكونوا كالذين تفرقوا واختلفوا من بعد ما جاءهم البينات واولئك لهم عذاب عظيم .. ) آل عمران /١٠٥ .

وە پێیان دەڵێ :( ولاتنازعوا فتفشلوا وتذهبَ ريحُكم ..) الأنفال /٤٦ . وە پێیان دەڵێ :( إِنَّ هذه أُمتكم أُمة واحدة وأنا ربكم فاعبدون ) الأنبياء / ٩٢ . وە پێیان دەڵێ :( ولاتكونوا من المشركين من الذين فرَّقوا دينهم وكانوا شيعاً كل حزب بما لديهم فرحون ) الروم /٣١ ، ٣٢ .

بەڵێ ئیمانێکی ئاوا تۆوی دووبەرەکیو ناکۆکی ناهێڵێو ڕەگ و ڕیشەی پەرتەوازەیی تاقم تاقمێنە لەبن دێنێو دەسووتێنێ .

وە دەربارەی هۆی دووەمیش ( ئیمان ) گەلی کورد ـ و هەر گەلێکی دیکەش ـ وا لێ دەکات کە لە سایەی خواناسین و هەموو شتێک لەو زانینەوە لەسەر لاقی خۆی بوەستێو بەس پشت بەخوای خۆی ببەستێ ، چونکە ئیمانەکەی پێی دەڵێ :( .. إِن كنتم آمنتم بالله فعليه توكلوا إِن كنتم مسلمين ) يونس / ٨٤ . وە پێیان دەڵێ :( وعلى الله فليتوكل المتوكلون ) ابراهيم /١٢ . وە دەڵێ :( يا ايها النبي حسبك الله ومن اتبعك من المؤمنين ) الأنفال / ٦٤ .

وە ئەو گەلە مسوڵمانە بەحوکمی ئیمان و خواپەرستییەکەی ویردی سەر زمانی ( إِياك نعبد وإِياك نستعين ) ە !!

وە دەربارەی چارەسەرکردنی نەخۆشی سێیەمیش ئیمان ئەم فەرمان و ئامۆژگاری یانە دەکاتە چارەسەر :( يا أُيها الذين آمنوا لاتتخذوا اليهود والنصارى أولياء ) المائدة /٥١ . وە ( ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملَّتهم .. ) البقرة / ١٢٠ . وە ( يا ايها الذين آمنوا لاتتخذوا [illegible] .. ) الممتحنة/١ .

ئنجا ئەگەر ئەم فەرمانانەیان [illegible] کرد [illegible] بەر حوکمی ئەم موژدەیە :( وإِن تصبروا وتتقوا [illegible] كيدهم شيئاً إِن الله بما يعملون محيط ) آل عمران / ١٢٠ .

وە ئیمان دەرمانی خەسڵەتی بەدو [illegible] چوارەمیش بەو دەقە زۆرو

زەوەندانە دەکاتکە لە چەندان شوێنی قورئان و سوننەتدا دووبارە بوو وتەوەو داکۆکی لەسەر ئەوە دەکەن کە تاک و کۆمەڵی بڕوادار نابێ بێجگە لە ڕەزامەندی خوا و پاداشتی ئەبراوەی بەهەشت هیچ جۆرە پاڵنەرو هاندەرێکی دیکەی ماددی و مەعنەوی بیان جوولێنێ ، دەنا کردەوەکانیان بەهیچ دەردەچن و دەبنە سەپانی پووشێ و لەجیاتی پاداشتسزای سەختیشچاوەڕێ یانە !

وە لەڕاستیدا خەسڵەتی ئیخلاص و نیازو مەبەستساغو سافکردنەوە لە هەر جۆرە هاندەرێک جگە لە ( خوا لەخۆ ڕازیکردن ) کە لە ئیسلامدا بە هەوێنی مەیینی شیری هەموو کردەوە چاکەکان دانراوە ، ئەمامێکە تەنیاو تەنیا لە زەوی ئیمان و ئیسلامدا دەڕوێ و بەهیچ شێوەیەک بیرو بیردۆزە ماددی و مرۆڤکردەکان ناتوانن تاقە ئینسانێکیش بێ بگەیەنن کە بەشێوەیەکی ڕاستەقینەو تاسەر خاوەنی ئەم خەسڵەتە بەرزو پیرۆزە مەعنەوی بە بێ .

ئنجا زاڵ بوونیش بەسەر کۆسپی پێنجەم و کۆتاییدا پاشلابردنی کۆسپ و بەرچەکانی پێشەوەی ، شتێکی حەتمیو سۆگەرە . چونکە گەلێکی خاوەن ئیمانی دڵ پێکەوە جۆشدراوو یەکگرتوو و لەسەر پێی خۆی وەستاوو پشتبەخوا بەسبور و زیرو وریا و بێدارو تێگەیشتوو و ساغو بۆخوا یەکلابووەو بەگوێرەی بەبڕەوی خوا بەرێوەچوو ، مەحاڵە مەحاڵ ببێتە نێچیرێکی فەقیرحاڵ و بێ پەرو باڵ و بە تۆڕو داوی نەخشەو پیلانەکانی دوژمن و ناحەزانی پەوە بێ !

بەڵێ سیاسەتی ئیمپریالیزمی جیهانی قەتتوانای ئەوەی نییە چۆکبە گەلێکدابداتکە بەپێی نەخشەو بەرنامەی ڕەببانی بارهێنراوەو بەرێوەدەچێ !!

دووەم : ئێمە دژی دیموکراسی و پەرلەمانین نەک ئازادی بیروڕاو هەبوونی ئەنجوومەن و شووڕا :

بەڵێ ئێمە دژی دیموکراسیین ـ وەک لەپێشەوە باسکرا ـ چونکە ئایین و بەرنامەکەمان ڕێگامان نادات جگە لە بەرنامەی خوا دوای هیچ شتێکی دیکە بکەوین ، وە دژی پەرلەمانێکین کە لەو دیموکراسی یەیەوە پەیدا دەبێ کە هیچ حیسابێک بۆ خواو پێغەمبەرو بەرنامەکەی ناکات ، چونکە پەرلەمانێکی ئاوا خوایەتی بەسەر کۆمەڵگادا دەکات و دووچاری بتپەرستی یان دەکات ، بەڵام نەک هەر دژی ئازادی بیروڕا دەربڕین و پێکهێنانی ئەنجوومەن و هەبوونی ڕاوێژ لە هەموو چین و توێژو ئاستەکانی کۆمەڵگادا نین ، بەڵکو بەهەموو تواناشمانەوە هەوڵی وەدیهێنانیان دەدەین ! چونکە جارێ هەر بەردی بناغەو یەکەمین و گەورەترین وشەو دروشمی بیروباوەڕو ئایینەکەمان کە ( لا إله إلاّ الله ) یە گەورەترین شۆڕشە بەسەر هەموو جۆرو شێوەکانی چەوساندنەوەو ستەم و بێدادی و سەرکوتکردن و دەنگ کپکردنی ئینسانەکان دا ، وە لەڕاستیدا ئایین بۆیە هێندە لەسەر خوابەیەکزانین و یەکتاپەرستی ( توحيد ) نووره ، چونکە لەم ڕێ یەوە نەبێ مرۆڤ لە کۆیلایەتی و ژێردەستەیی و زەبوونی ڕزگاری نابێ ، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا کە مەسەلەی یەکتاپەرستی هێندە گرنگ و کاریگەرو پێویستە لە ژیانی تاک و کۆمەڵ دا ، واش ئیسلام بەس لە ڕێگای عەقڵ و ویژدان و قەناعەت پێ هێنانەوە ئینسانەکانی بۆ بانگکردوون و نەیکردووە بە شتێکی تۆبزی و زۆرەملێ بەبیانووی ئەوەی کە بەرژەوەندی خۆیانی تێدایە ،

خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە فەرموویەتی :( فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر ) الكهف / ٢٩ . هەروەها فەرموویەتی :
( لا إكراه في الدين قد تبين الرشدُ مِن الغيّ .. ) البقرة /٢٥٦ .

وە مەسەلەی گرنگیو پێویست بوونی ڕاویێژ ( شوری ) و دروست بوونی کۆڕو ئەنجوومەن لەسەر هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگادا لەڕوانگەی ئیسلامەوە لە باسەکانی پێشوودا چاک ڕوونکرایەوەو، سەلمێنرا کە هەبوونی ڕاوێژ لەنێو گەل و کۆمەڵی بڕواداردا بەس ڕەوشت و خەسڵەتێکی پەسندو چاک نیەو هیچی دی ، بەڵکو بەشێکی گرنگی پێکهێنەری ئیمان و ئیسلامەتیەکەیانەو، بەبێ وی ئەوە هیچ کە ناتوانن ئایینەکەیان بەڕێوەبەرن ، تەنانەت ئیمان و ئیسلامەتی ـ یەکەشیان ناتەواوو لەنگ و لاتەڵ دەبێ، وە دیارە بەدیلی بێ پێچو پەنای ڕاوێژ ( شوری ) و پێکهێنانی ئەنجوومەن ، دیکتاتۆریەت و پەیدابوونی چەوساندنەوەو سەرکوت کردن و داپڵۆسینی جەماوەرە بەواتایەکی دیکە تاقە بەدیلی ڕاوێژو ئەنجوومەن ، پەیدابوونی طاغووت و فیرعەونایەتی کردنە بەسەر خەڵکیدا ، کە ئەمەش یەکسەر لەگەڵ ئەسڵ و بنچینەی ئیمان دا تێک دەگیرێ کە بریتیە لە یەکتاپەرستی ( التوحید ) !!

وە ئیسلامیش هێندەی بەو مەسەلانە قەڵس و تووڕەو ( حسّاس ) ە کە لەگەڵ یەکتاپەرستیدا دژن و تێک دەگیرێن ، بەهیچ شتێکی دیکە هێندە قەڵس نیەو تێک ناچێ، هەربۆیەشە کە لە قورئانێ دا ( ئەگەر ) ێک هەیە بۆ بەخشران و داپۆشی لێکرانی هەموو جۆرە گوناهو تاوانەکان ـ ئەگەر خوا بیەوێ ـ شتێکیە لە هاوبەش بڕیاردان ( الشرک ) ، چونکە ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەسڵی ئیسلامدا کە یەکتاپەرستی ( التوحید ) یە تێکدەگیرێ ( ... إن الله لا یغفر أن یشرک به ویغفر مادون ذلک لمن یشاء ومن یشرک بالله فقد افترى إثماً عظیماً ) النساء / ٤٨

# بەشی شەشەم
# ئایا بێجگە لە ئیمان چارەیەکی ترمان هەیە؟!

خوێنەری بەڕێز !
بەیارمەتی خوای بەخشەر لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین لە سێ خاڵدا وەڵامی ئەم پرسیارەی سەرەوە بدەینەوە :

یەکەم : زانست و عەقڵ و فیطرەت دەڵێن : نەخێر !

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! ئەوە کە بێجگە لە ( ئیمان ) هیچ چارەو دەرەتانێکی دیکەمان نیەو، لەڕێ ی غەیری ئیمان و ئیسلامەوە وەک تا ئێستا ویڕای کردو کۆش و خەبات و قوربانی دانی زۆر بەهیچ نەبووین و نەگەیوین ، بەهیچ نابین و ناگەین حەقیقەت و ڕاستی - یەکی بێ هێج و پەنایە کە زانیاری و عەقڵ و فیطرەتی ساغ پشتگیری دەکەن ، چونکە :
١- بەرەوپێش چوون و گەشەکردنی زانست لە هەموو لق و بەشە جۆراوجۆرەکانیدا لە دوو بواری زانیاری یە ئینسانی یەکان و ( العلوم الأنسانية ) زانیاری یە سروشتیەکان ( العلوم الطبيعية )دا بۆتە هۆی هەرچی زیاتر سەلماندن و پشتگیری کردنی هەموو ئەو ڕاستی و یاسا و دەستوورانەی کە ئیسلام لە دوو بواری بیروباوەڕو بەرنامە ( العقيدة والشريعة ) دا ڕای گەیاندوون ، وە هەتا ئێستا یەک تاقە حەقیقەتێ سەلمێنراوی زانست نیە کە لەگەڵ یەکێک لە یاسا و دەستوورەکانی ئیسلامدا تێک بگیرێ ، بەڵکو قورئان و سوننەت پڕبڕن لە ئاماژەگەل ( إشارات ) ی جۆراوجۆر دەربارەی

گەلێک لەو ڕازو نهێنیيانەی دەرو دەروونی ئینسان و دەوروبەری و ، بوونەوەر کە تازە زانیاری خەریکە پەیان پێ دەبات .

وە شایانی باسە کە ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕان و هەڵگرانی بڕوانامە ( شهادة ) بەرزەکانی زانستکە لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوادا نیشتەجێن ، پاش لێکۆڵینەوەو حاڵی بوونیان لە ئیسلام موسڵمان دەبن و ، ڕێژەشیان بەردەوام لەزیادبوون دایە .

ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە بەرەوپێش چوون و فراژوو بوونی زانستبۆتە هۆی بێ نموودی و لە ڕەواچکەوتن و وەدرۆ خستنەوەی گەلێک لەو بیردۆزە بریقەدارو بەناو زانستی يانەی کە لەگەڵ یەکێکیان زیاتر لە ڕاستیيەکانی ئیسلامدا دژایەتی یان هەیە . بۆ وێنە هەرکام لە داروینیزمو فرۆیدیزمو کۆمۆنیزم و مارکسیزمو ئەگزیستالیزمو کاپیتالیزمو .. هتد لەبەر تیشکی زانیاری نوێ دا پووچەڵ بوونەوەو لەبرەوکەوتوون و ئێستا لەو وڵاتانەدا کە تێیان دا لەدایکبوو ون کەس بە ڕەیان ناپێوێ .

٢- لەسۆنگەی ئەوەوە کە ( زانیاری )[1] گەورەترین و چاکترین بەرهەمی عەقڵە ، پشتگیری کردنی زانیاری لە ڕاستیيەکانی ئیمان و ئیسلام پشتگیری کردنی عەقڵیشە ، بەڵام چەند دێڕێکیش لەوبارەوە دەنووسین :

جارێ ئەگەر بێت و هەرچی عەقڵ و بیرو هۆشی مرۆڤ - دوور لە ڕێڕوونی وەحی - کە هەر لە سەرەتای مێژووەوە تا ئێستا بەرهەمی هێناوە - کە پێی دەگوترێ ( فەلسەفە ) - لەگەڵ یاساو بڕیارەکانی ئیسلامدا بەراوردی بکەین دەبینین هێندە کەمو کورت و کچکەو نابووت و بێ هەڵەو پەڵەیە هەر شەرم دەکات سەر بەرز بکاتەوە ،

---

(١) وشەی ( علم ) لە قورئانێدا بەهەموو ( صيغة ) کانیيەوە نزیکەی ( ٧٥٠ ) جار دووبارە بۆتەوە !!

ئەوانەی کە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی قووڵ و فراوانیان دەربارەی ئەلـەئە هەیە ( نەک کەمو سەرکێڵ ) دەزانن چ دەڵێمو ڕاستـــــیی ئەم قسەیەم بەگیان و دڵ دەسەلمێنن !

وە لەلایەکی دیکەوە هەتا ئێستا بە هەموو بیتۆڵ و زیـــــــرو عاقڵ مەندانی دنیا نەیان توانیوە تەنانەت یەک ڕەخنەی بەجـــێ و ماقووڵ لە یەکێک لە یاساکانی ئیسلام بگرن ، بەڵکو کامەیان لـە هەموویان زیرترو تێگەیشتووترە - ئەگەر بێ بڕوا و نامسوڵمانیـــش بێ - لەهەموویان زیاترو چاکتر شایەدی ی بۆ ڕاستیی و بێ هەڵەیی یاساو بڕیارە جۆراوجۆرەکانی ئیسلام داوەو سەری ڕێزو تەقدیسی لە ئاقاردا دانواندوە . بەمەرجێک بەشێوەیەکی ڕاستو دروست ئیسلامی ناسیبێو پێی ئاشنا بووبێ ، یان پەردەی ڕەشی ( تعصب ) ی بێجێ و بوغزو قینی ناحەزانە دەربارەی ئیسلام چاوی عەقڵ و دڵــــــــی دانەپۆشیبێ .

بەندەش بەوپەڕی دڵنیایی‌و پشت ئەستووری یەوە ڕای دەگەیەنــــم کە کێ ڕێزو حورمەتی عەقڵ و [1] ڕاستی لەلایەو، لەڕووی تێگەیشتن و ئاکاداریشەوە بڕوای بەئیسلام نیە ، حەزدەکەین تاقە یەک ڕەخنەو ناتەواوی زانستانەو زیرانە لە بەرنامە تەرووتەواوەکەی خـــــوای پەروەردگاردا بدۆزێتەوە !!

٣- لەبەرئەوەی هەر ئەو زاتە زاناو کاربەجێو توانایەی کە ئیسلامــی کردۆتە دوابین بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی مرۆڤایەتی ، هەر ئەویــش ئینسانی دروستکردوەو لەسەر ئەو فیطرەتە ئینسانیەی کە لەسەریەتی سروشتاندوویەتی ، بەڵێ لەبەرئەوە بەرنامەی خوا بۆ مرۆڤ کالایەکی پڕ بە بالایەتی‌و هیچ کەمو زیادی یەکی نیە ، خوای پەروەردگـــــار لەوبارەوە فەرموویەتی :( فأقم وجهک للدین حنیفاً فِطرةَ اللہ التي

---

(١) وشەی ( عقل ) و ( لُبّ ) و ( فکر ) بەهەموو ( صیغة ) کانیانـەوە نزیکەی ( ٥٠ ) جار لەقورئاندا هاتوون !

فطر الناس عليها لاتبديل لخلق الله ذلك الدّين القيّم ولكن أكثر الناس لايعلمون ) الروم / ٣٠ . واته :
ڕووی خۆت بەپاکی بەرەو بەرنامە ـ ی خوا ـ ڕاست بکە ، ئەو فیطرەتەی کە خوا خەڵکی لەسەر خوڵقاندوە ، گۆڕانیش بەسەر دروستکراوی خوادا نایەت ، ئەوەیە ئایینی ڕاست و تەواو ، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن !

وەک لەم ئایەتە بەپیرۆزەدا دەبینین ( ئایین ) ی خوا و (فیطرەت )ی مرۆڤ بە یەک شت ، یان بە دوو ڕووی یەک حەقیقەت دانراون ، کە لەڕاستیدا هەر واشەو هەرکەسێک زانیاری و شارەزاییەکی چاکی دەربارەی ئایینی خوا هەبێ و بە سروشت و داخوازی یەکانی ڕووح و عەقڵ و جەستەی ئینسانیش ئاشنا بێت و پێکەوە لەبەریەکیان ڕابگرێ و بەراوردیان بکات ، دڵنیا و مسۆگەر دەبێ کە ئەو ئایین و بەرنامە تێروتەواوە بەپێی سروشتی مرۆڤ بنیات نراوەو هەموو داخوازی یەکانی سروشتی مرۆڤی تێدا ڕەچاو کراوە .
بەڵام لەلایەکی دیکە بەپێچەوانەوە دەبینین هەموو ئەو ڕێچکەو بیردۆزانەی کە لە ڕابردوودا پێیان هەڵدەگوترا و پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرا ، دوای ئەوەی کەوتنە نێو کوورەی تەجرەبەو تاقیکرانەوەی ژیان و گوزەرانەوەو ( مَحَكُّ العَمَلِ ) ی درووشمایەتیهان بەسەرچوو و کۆمەڵگاکان لەگەڵیان دا کەوتنە تەجرەبەی کردەیی یەوەو ، خەڵک بۆیان دەرکەوت کە لەگەڵ فیطرەت و ڕەوتی ژیان و گوزەرانیان دا ناگونجێن و وەڵامگۆی داخوازی یە سروشتی یەکانیان نین و گیروگرفتە ـ کانیان یان پێ چارەسەر ناکرێ ، بێشتر چەندە بەگەرمی پێیان هەڵدەگوتن و پڕوپاگەندەیان بۆدەکردن ، دواتر گەلێک بەگوڕتر و دڵگەرمانەتر لێیان کەوتنە تەقەو کارێکیان پێ کردن ( با ) بە دەواری شڕی نەکردبێ !!

زەقترین و زیندووترین نموونەی ئەو ڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤکردو دژ بە فیطرەت و لەگەڵ ڕەوتی ژیان دا نەگونجاوانەش مارکسیزم و کۆمۆنیزم بوو، کە دوای ئەوەی بووبەهۆی پەیدابوونی دەیان کێشەو گیروگرفتی گرجووبڕو چارەنەکراوی ئابووری و فیکری و سیاسی و کۆمەلایەتی و ئەخلاقی و عەسکەری و .. هتد بۆ دەوڵەتی ( یەکێتی سۆڤیەت ) بەتایبەتی و دەوڵەتە مارکسیزم و سۆسیالیزمییەکانی دیکە بەگشتی ، فڕێیان دایە زبڵدانی مێژووەوەو سەد نەفرینیشیان کردە پاشکۆی !

کۆتایی ئەم باسەشبەم دوو ئایەتە بەهێزو پێزە دێنین :

یەکەم :( سَنُريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتى يتبين لهم أنه الحق ، أوَلَم يكف بربك انه على كل شيء شهيد ؟ ) فصلت / ٥٣ .

واتە : لەمەودوا نیشانەو بەڵگەکانی خۆمانیان پێشان دەدەین لە ئاسۆیەکان و لەخۆیان دا هەتا بۆیان دەردەکەوێ کە ئەو - خوا ، قورئان - ە ڕاستە ، ئایا ئەوەندە بەس نیە بۆ پەروەردگارت کە بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرە ؟

وەک دەبینرێ خوای بەرزو مەزن موژدەو مزگێنی هەرچی زیاتر[1] ڕوون بوونەوەو ئاشکرابوونی هەقێتی خۆی و بەرنامەکەی بە مرۆڤایەتی دەدات ، دیارە ئێستا ش لەسایەی گەشەکردن و پەرەستاندنی زانستەوە حەقیقەت و هاتنەدی ئەم موژدە بەرزو پیرۆزەی خوا وەک مانگی چواردە دەبینرێ .

دووەم :( .. ماترى في خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور .. ) الملك / ٣ . واتە :

---

(١) بەحوکمی ئەوەی کە ( س ) ی سەر ( سنريهم ) بۆ داهاتوو ( مستقبل ) ە ، موژدەکە هەمیشە بەردەوامە .

.. لە دروستکراوی خوای میهرەبان دا هیچ ناڕێکی نابینی ، چاوی پێدا بگێڕە بزانە هیچ ناتەواوی ی دەبینی ..

لەم ئایەتەش‌دا خوای زانا و کاربەجێ هەموو مرۆڤایەتی بانگ دەکات‌کە سەرنجی بوونەوەرەکەی بدەن و تێبەوە ڕابمێنن داخوا هیچ ناڕێکیو بێ یاسایی دەبینن !!

دیارە تا ئێستا هیچ کەس‌هێندەی سەری دەرزی یەش‌کەم وکووڕی و بێ یاسایی لە هیچ کام لە دروستکراوەکانی خوادا بەدی نەکردوە ، بەڵکو کامەیان لە هەموویان زاناترو بە ڕازو نهێنییەکانی بوونەوەر ئاشناترە لە هەموویان چاکترو زیاتر شایەدی بێ هەڵەو بەڵەییو ئەوپەڕی یاساداری و ڕێک وپێکی بۆ دروستکراوەکانی خوا دەدات .

دەجا بێگومان هەروەک چۆن بوونەوەر ( کۆن ) کردەوەی خوایە ، ئایین ( دین ) یش ئەو فەرموودەیەتی ، هەربۆیەش هەردووکیان لەقەدەر ئەو سەرچاوەیەن کە لێیەوە هاتوون و ، هەرکامێکیان بەڵگەو شایەدی زانایی و کاربەجێیی و توانای ئەو پەروەردگارەن کە بە ویستی وی وەدیهاتوون !

دووەم : واقیعی مێژوویی کۆن و نوێ دەڵێ : نەخێر !

بەڵێ خوێنەری هێژا ! هەروەک چۆن عەقڵ و زانست و فیطرەتی ئینسان دەڵێن : نەخێر بێجگە لە ئیمان چارەیەکی ترمان نییە ، واقیعی مێژوویی کۆن و نوێی عولەمان و ئەوانیش هەر وادەڵێن .

بەڵام بێگومان شیکردنەوەو خستنەڕووی چۆنیەتی ئەو شایەدی دان و دان پێدا هێنانەی مێژووی ڕابردوو و هاوچەرخی عولەمان و گەلانی دیکە کارێک نییە کە لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەدا بگونجێ هەر زۆر بەکورتیو

گوشراویپیش ئەنجام بدرێ چ جای بەدرێژی ، بۆیە ناچارین هـــەروا
بەکورتی چەند خاڵێک لەوبارەوە بنووسین :

١ـ چاوپێداگێڕانەوەیەکی مێژووی مرۆڤایەتی بە ئاشکرا دەری دەخات کە بەختەوەرترین و سەرکەوتووترین و پڕ هێمنیو ئاسایشترین و ، پاکترین و بەکورتی ( ئینسانی ) ترین کۆمەڵگا ، ئەو جـــۆرە کۆمەڵگایانە بوو ون کە بە ڕووحی ئیمان و خواناسیەوەو لەژێـــر سێبەری بەرنامەکانی خوادا ژیاون . وە بەپێچەوانەوە زینتـــاڵ ترین و پڕتەنگ و چەڵەمەترین و نزمترین و ئاژەڵانەترین کۆمەڵگاش ئەوانە بوو ون کە لە هیدایەت و ڕێڕوونی خوا دوورەپەرێـــــز بوو ون و ، لە ڕووناکی بڕواو خواپەرستی بێ بەش بوو ون .

بەڵام گرنگ ئەوەیە کە لەم چاوپێداگێڕانەوەیەمان دا خواپەرستیو ڕەوشت بەرزی و دادگەری و ئازادی و برایەتیو تەبایی و ئاسایـــش بکەینە پێوەرو تەرازووی بەختەوەری و ئینسانەتی مرۆڤ . نـــەک کۆشک و تەلاری بەرزو کارگەو بەرهەمی زۆرو پیشەسازیو تەکنۆلۆجیای پێشکەوتوو .. هتد دەنا ئەوکاتە دەبێ بڵێین : کۆمەڵگاکانـــی ژێر ڕکێفی فیرعەون و نەمروودو جەنگیزو هیتلەرو ستالین و صەددام ... زۆر بەختەوەرو کامەڕان بوو ون !!

٢ـ سەرنجدان و وردبوونەوە لە واقیعی ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگـــا نەفامیو ماددی یانەی ئەم ڕۆژگارە دەری دەخات کە ئێنســـــان ـ چ لەشێوەی تاک و چ لەشێوەی کۆمەڵگادا ـ تا چ ڕاددەیـــــەک دووچاری زینتاڵیو چارەڕەشیو زەبوونیو بێ ئەمیەتیی بووە !
ئایا بەڵگە بۆ سووک و چرووک بوون و بێ بایەخ بوونی مرۆڤ لـــەوە زەقتر دەبێ چی بێ کە ساڵێ وا هەیە لە وڵاتێکی ( دیموکراســـی ) وەک ئەمریکادا ملیۆنەها تەن گەنمو دانەوێڵە دەسووتێنرێ یـــان لە دەریاکان دەکرێ(١) لەکاتێکدا کە لە وڵاتە نەدارو خێروبـــــر

---

(١) بۆ ئەوەی نرخی ئەو شتانە لە بازاڕ دانەبەزێ ، چونکە ( کُلَّمـــا زاد العرض قل الطلب ) !!

دزراوەکان دا ملیۆنەها کەس لەبرسان دەمرێ ؟!

وە دەبێ بەڵگەی بێ نرخبوون و کەم کەمیەتی مرۆڤایەتی لەڕوانگەی سیاسەتی نەفامێتی جیهانی[1] ئەمرۆ لەوە بەهێزتر چی بێ کە ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی ئامادەبوون دنیا بەسەر سەری ڕژێمی دیکتاتۆری ی بەغدادا کاول بکەن لەبەرئەوەی هێرشی کردە سەر ( کوێت ) کە یەکێکە لە کانگا نەوتی یەکانی ئەمریکا ، بەڵام هەر هەمان ئەمریکاو ڕۆژئاوا دەیان ساڵە تەماشاچی فیلمی قەڵاچۆکران و بنەبڕکرانی گەلێکی ( ٣٠ ) ملیۆنی وەک کوردن لەسەر شانۆی واقیع ، واقیعێک کە هەر بۆخۆشیان ڕەنگی بناغەکەیان ڕشتوە ؟!

ئایا ڕاستنیە کە بڵێین :( لە تەرازووی شارستانەتی ! ماددی و بێ بڕوای ڕۆژئاوادا چەند هەزار عارەبی کوێتی ( نەوتدار ) لە ( ٣٠ ) ملیۆن کوردی بێ چارەو نەدار گرنگترو قورسترن ) ؟!

وە دەبێ بەڵگە بۆ قەیران ( أزمة ) و بەبن بەستگەیشتوویی و ئیفلاسی ڕژێمە ماددی یە نەفامی یەکانی ئەم ڕۆژگارە لەوە پتر چی بێ ، کە ملیۆنەها منداڵی کوردو ئەفغانیو فەلەستینیو ئەفریقیو ... هتد لەبرسان و لەبەر بێ بەرگیو ڕەجاڵی یان دەمرن یان گیرۆدەی دەیان جۆرە نەخۆشی دەبن و پێیانەوە دەبنیسێن ، بەڵام بابای ئەمریکیو ڕۆژئاوایی وا هەیە کە میراتێکی چەند ملیۆنی بۆ تاقە ( سەگ ) ەکەی بەجێ دێڵێ و لەسەری تەرخان دەکات ؟!!

٣ـ ئنجا لەراستیدا لەسەر ئاستی گەلی خۆشمان هەتا بڵێی بەڵگەی

---

(١) زاناو نووسەری فەرەنسی ناوداری لەکۆن دا مارکسیو نوێ مسوڵمان ( روحیە گارودی ) لە کتێبی :( هشدار بە زندگان ) دا کە لە فەرەنسی یەوە وەرگێڕراوە ، چاک پەردەی لەسەر ڕووی دزێوی ئەم بەناو شارستانێتی یە ماددی یەی ڕۆژئاوا هەڵماڵیوە .

پتەوو سەلمێنەر زۆرو زەوەندن لەسەر سەلماندنی ئەو حەقیقەتـــە کە تاقە ڕێ ی سەرفرازی و تاقە چارەو دەرەتانمان هەر ئیمـــان و گەڕانەوە سەرخۆیەو هیچ شتێکی دیکە وەکدادی نەداوین دادمـــان نادات .

بەڵێ لەڕاستیدا گەلی ئێمە لە درێژەی خەباتی ڕزگاریخوازانەیدا ڕێچکەو بیردۆزەی مرۆڤزادەی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوایی نەماوە کە لـــە دنیای واقیعدا تاقی نەکردبێتەوەو نەیجەڕباندبێ ، هەر لـــــە لیبرالیزمو دیموکراسیو ناسیۆنالیزمەوە بگرە هەتا هەموو جـــۆرو شێوەکانی سۆشیالیزمو مارکسیزم !
بەڵام کوا ئەنجامو بەرهەمەکەیان بۆ گەلی کورد ؟!! بێگومـــان چش ! مەگەر شەری یەکتر کوشتن و خەنجەر لەپشتی یەکتردانـــــی ڕابردوو و ددان لەیەک سوێن و گوریس بچڕکێنە پێکردنی جەماوەرو لەیەکتر تیژکردنیو پارچەپارچەکردنی بەهۆی درووشمو ڕەنگی زۆرو جۆراوجۆرەوە لەم قۆناغەدا بە ئەنجامو بەرهەمێکی چاکدابنرێن .

سێ یەم : مادام گەلێکی مسوڵمان و بڕوادار بین ، [illegible] !

بەڵێ مسوڵمانان لێیان قەدەغەکراوەو بۆیان نیە جگە لـــە بەرنامەی خوا دوای هیچ ڕێبازێکی دیکە بکەون ، [illegible] ئیمان و مسوڵمانەتییەکەیان بەوە پەیدادەبێو دادەمەزرێ کە ئیسلام بەرنامەی ژیان و گوزەرانیان بێو [illegible] جێ پێی پێغەمبەری پێشەوادا بەڕێوە بچن ، خوا [illegible] لەوبارەوە فەرموویەتی : ( .. الیوم [illegible] لکم [illegible] علیکم نعمتي ورضیت لکم الاسلام دینا [illegible]
.. ئەمڕۆ بەرنامەکەتانم بۆ تەواو کردن وە چاکە [illegible] تەواوی بەسەردا ڕشتن ، وە ئیسلام بە بەرنامە بۆ هەڵبژاردن [illegible]

هەروەها فەرموویەتی :( إن الدين عند الله الأسلام .. )
آل عمران / ١٩ . واتە :
بەرنامە ـ ی ژینی مرۆڤ ـ لەلای خوا بەس ئیسلامە .
دیسان فەرموویەتی :( ومَن يبتغ غير الأسلام ديناً فلن يُقبَل منهُ وهو في الآخرة منَ الخاسرين ) آل عمران / ٨٥ . واتە :
وە هەرکەسێک جگە لە ئیسلام بەرنامەیەکی تر بخوازێ لێـــــــی وەرناگیرێ و لە دواڕۆژیشدا لە زیانبارانە .

لەکۆتاییدا دەڵێم :

جێی سەرسوورمانە ئەوەیە کە هەرکام ـ مەگەر بەدەگمەن ـ لەوانەی خۆیان بە دەمڕاست و سەرکردەو مشوورخۆری ( کورد ) دەزانـــــن ، دانی پێدا دێنن کە ( گەلی کورد گەلێکی موسڵمانە )، جا هەڵبەتــە موسڵمانەتی گەلی کورد حەوجێی بە شایەدی دان نیەو بۆ سەلماندنی موسڵمانەتییەکەی یەکی لەسەر دان پێداهێنانی وان نەکەوتوە ، بەڵام لێرەدا مەبەستێکم هەبوو کە ئەم مەسەلەیەم خستەڕوو ، ئەویـــش ئەمەیە :

کە مادام هەموو لایەک دەیسەلمێنین و دانی پێدا دێنین کـــە گەلەکەمان بڕوادارو موسڵمانە ، باشە بۆ نابێ بیر لەوە بکەینەوە کە لانی کەم دوای ئەوەی تەجرەبە تاڵەکانی مێژووی خەباتـــی لە مێژساڵەی ڕزگاریخوازیمان پێیان سەلماندووین کە لەڕێ ی ئـــەو ڕێچکەو بیردۆزانەوە کە دژ بە بیروباوەڕو سروشت و عەقـــڵ و دەروونی گەلەکەمانن هیچمان بۆ ناکرێ و هەر زیاتر لەسەریـــان قەرزدار دەبینەوە ، لەمەودوا ڕێڕەوەکەمان بگۆڕین و هەوڵ بدەین ئەوەش تەجرەبە بکەین کە ( لەڕێ ی بیروباوەڕی گەلەکەمانـــەوە کە ئیسلامە هەوڵی خزمەتکردنی و چارەسەرکردنی گیروگرفـــت و کێشەکانی بدەین ) ؟!!

ئایا هەرکام لەو برادەرانە ـ کە خۆیان بە دەمڕاستو سەرکردە یان لانی کەم نیمچە سەرکردەیەکی گەلی کورد دەزانن ـ دوای ... لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی وردو قووڵی عیلمیانەو بابەتیانـــە دەربارەی ئیسلام هەڵەیو ناتەواوی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتوە بۆیــە بڕوایان پێی نیەو بە بەرنامەی ژیانی گەلەکەیانیشی دانانێن ؟!!

ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە ( بەڵێ ) بێ ، دەڵێم : دەجـــــنا دڵسۆزی و ڕاستکردنیان لەگەڵ ( کوردایەتی ) دا لەسەریان پێویست دەکات کە ئەوەی بۆخۆیان تێیدا بەئەنجام گەیشتوون کە هەڵـــەو ناتەواوەو بەکەڵکی ژیان نایەت ، دەبێ بە گەلەکەشیانی ڕابگەیەنن تاکو چیدی دەستەوەزۆ نەبێو ، بەدوای کڵاوی بابردوو نەکەوێ .

خۆ ئەگەر وەڵامەکەش ( نەخێر ) بێ ، ئەوە دەڵێین : عەقـــڵ و زانستو وێژدان و بەرژەوەندی و کوردایەتیو نیشتمان بــــەروەری لەسەریان پێویست دەکات و لە ڕابردووش‌دا پێویستی دەکرد کــــە نەدەبوو هەروا بەبێ لێکۆڵینەوەو بەبێ بەڵگەو شارەزایـــــــــی ( ئایین و بیروباوەڕ ) واتە گەورەترین و پیرۆزترین و خۆشەویست ترین شتی ئەو خەڵکو گەلەی کە خۆیان بە دڵسۆزو خزمەتگـــوزاری دەزانن ، وەلابنێن و بەملاولادا بگەڕێن بۆ بیروباوەڕو بەرنامەیەک(١)!

کۆتایی ئەم بەشەش‌بەم ئایەتە بەرزو بەپێزە دێنم :

( وما كان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضى الله ورسوله أمراً أن يكون لهم الخيرة من أمرهم .. ) الأحزاب/ ٣٦ . واتە :

وە هیچ پیاوو ئافرەتێکی بڕوادار هەرکاتێک خواو پێغەمبەرەکـــەی بڕیارێکیان دا مافی هەڵبژاردنی کردن و نەکردنیان نیە ..

---

(١) سەرم لەوە دەرناچێ کە چۆن کەسانێک ڕێزو حورمەت بۆ ئاییـــن و بیروباوەڕی گەلەکەیان دانەنێن ، کە گەورەترین و پیرۆزتریـــن و خۆشەویست ترین شتیانە ، دەتوانن خزمەت بەو گەلەیان بکـــەن و بیحەسێننەوە !!

بەڵێ هەر ئینسانێک و هەر کۆمەڵێک خۆیان بە بەندەی خواو خوا بە خاوەن و پەروەردگاری خۆیان بزانن لەسەریان پێویستە - بە حوکمی ئیمانەکەیان - لەبەرانبەر حوکم و بڕیاری خوادا گەردن کەچ و فەرمانبەر بن .

کەواتە :

مادام گەلی کورد ئیمانی بەسەر کوفردا و ئیسلامی بەسەر غەیری ئیسلامدا هەڵبژاردوە ، هەتا بیەوێ ناوی ئیمان و ئیسلامی پێوە بمێنێ و لە موسڵمان نەشۆرێ ، ناچارە هەر ( ئیسلامی)[1] بێ و بۆی نیە نە ببێتە مارکسی ، نە شیوعی ، نە بەعسی ، نە دیموکراتی نە لیبرالی .. هتد ، چونکە نە موسڵمانەتی ناوی بێ نێوەڕۆکەو نە ( ئیسلام ) یش بەرنامەیەکی قرپۆکە !!

---

(١) بەڵگەنەویستە کە ( ئیسلامی ) بوون لە جوغزی بزووتنەوەو ڕێکخراوێکی دیاریکراودا کورتهەڵنەهاتوەو هەر موسڵمانێک ئیسلام بە بەرنامەو پەیڕەوی ژیانی بزانێ و بەپێی توانای لەو ڕێیەوە هەوڵ بدات ، ئەوە ( ئیسلامی ) یە .

# بەشی حەوتەم
# لەکوێوەو چۆن دەست پێ بکەین ؟!

خوێنەری خۆشەویست !

خوا پشتیوان بێ لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین چۆنیەتی گرتنی ڕێبازی ( ئیمان ) و موسوڵمانەتی ـ کە سەرفرازی و بەختەوەری دنیاو دوارۆژی تێدایە ـ بخەینەڕوو، بە واتایەکی دی لەسۆنگەی ئەوەوە کە لە باسەکانی پێشوودا تا ئەندازەیەکی چاک ئەوە ڕوون کرایەوەو سەلمێنرا کە ئێمەی کوردو هەر گەل و کۆمەڵێکی دیکەش لەڕێی ئیمان و ئیسلامەوە نەبێ بەئامانج ناگەین . لەم بەشەدا بەشێوەیەکی کردەیی ( عملي ) قۆناغەکانی ڕێبازی ناوبراو ڕوون دەکەینەوە ، ئەم بەشەش لەم خاڵانەی خوارێ پێکدێ :

١ـ خواناسین و خۆناسین
٢ـ ئیمان و بەندایەتی
٣ـ یەکگرتن و برایەتی
٤ـ خۆگۆڕین و واقیع گۆڕین

یەکەم : خواناسین و خۆناسین :

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! بەردی بناغەو یەکەمین نوختەی ڕێبازی ( ئیمان ) ( خواناسین و خۆناسین ) ە ، چونکە لەڕوانگەی ئیمان و ئیسلامەوە ـ کە تاقە ڕوانگەی حەقیقەتناسیە ـ ئەم بوونەوەرە ( شاری بێ خاوەن نیە ) ، دەجا بێگومان بۆ ڕەفتارکردن و هەڵس و کەوتکردنێکی ڕاست و بەجێ لەگەڵ هەر شتێکدا پێویستە

ئاراستەکردن و داب و دەستوور ( التوجيه والتعليم ) تەنیا و تەنیا لە خاوەنی ئەو شتە وەربگیرێ ، هەربۆیەش مووسا عليه السلام لە وەڵامی پرسیاری : پەروەردگارتان کێیە ( فَمَن ربكما ..؟! ) ی فیرعەون دا فەرموویەتی : پەروەردگارمان ئەو زاتەیە کە بوونی بە هەموو شتێک بەخشیوەو دوایی ڕێڕوونیشی کردوە ( ربّنا الذي أعطى كل شيءٍ خلقه ثم هدىٰ ) طه / ٤٩ ، ٥٠ .

بەڵێ لەڕوانگەی ئیمانەوە بۆئەوەی بتوانین ژیانێکی ڕاست و دروست بەرینەسەرو بزانین چۆن و بۆچی بژیەین ، پێویستیمان بەوە هەیە کە خۆمان و ئەم ژیانەو بوونەوەر بناسین و حیکمەت و هۆی دروست بوونیان بزانین . ئەمەش پەکی لەسەر ئەوە کەوتوە کە خاوەن و بەدیهێنەری بوونەوەرو ژیان و ئینسان بناسین و پەیوەندی لەگەڵ ببەستین و لێی بپرسین :

کە ئێمەو ژیان و بوونەوەر چین و لەکوێوە هاتووین و بۆچی و بۆکوێ دەچین ؟!

ئنجا کە وەڵامی ئەم پرسیارانەمان زانی و حیکمەت و هۆی دروست بوونی بوونەوەرو ڕەخسێنرانی ژیان و خوڵقێنرانی خۆمانمان زانی، ئەوکاتە لەبەر تیشکی ئەو ( زانین ) ەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئێمەی ئینسان چین و شوێنمان لە ( إعراب ) ی بوونەوەردا چییە ؟! ئەوکاتەش دەزانین کە پێویستە چۆن و بۆچی بژیەین !!

جا هەرچەندە ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەو جۆرە باسانە تەرخان نەکراوەو، لێکۆڵینەوە لەو بارانەوە شوێنی دیکەی بۆ دانراوە (1)

---

(1) کتێبی ( گەورەترین ڕاستی ) کە بەرگی یەکەمی چاوەڕێ ی (چاپ)ە بۆ ئەو جۆرە باسانە تەرخان کراوە . وە لە هەرکام لە کتێبی ( پوختەیەک دەربارەی ئیسلام ) و ئاڵقەی یەکەمی زنجیرەی( ئیسلام و ڕێچکان ) و ئاڵقەی یەکەمی زنجیرەی :( با چاکتر ئیسلام بناسین!)دا چەند شتێک لەوبارەوە باسکراون .

بەڵام هەروا بەکورتی رێ بە سەرەکییەکانی خواناسی دەخەینەڕوو :
١ـ خۆناسین ( وفي أنفسكم أفلا تُبصرون ! ) :
بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! خۆناسین چاکترین و نزیکترین ڕێگـــای بەرەوخواچوون و خواناسینە ، چونکە ئینسان ( خۆ ) ی لە هەمــوو شتێک لێوە نزیکترەو ئەوەندەی دەتوانێ لەخۆی وردبێتەوەو سەرنجی بدات و بیناسێ ، هێندە توانای لێ وردبوونەوەو سەرنـــج دان و ناسینی هیچ شتێکی دیکەی نیە .
( خۆناسین ) بش دەگونجێ چوار رێ ی سەرەکی بۆ بگرینە بەر :
أـ وردبوونەوەو سەرنجدانی سەرەتاو سەرەنجام ( المبدأ والمصير ) ی خۆی
بـ تێوەڕامانی گیان ( روح ) و خەسڵەتە سەرسامکەرەکانی ، کــــە تەصەووف و دەروونزانی دوو بارمەتیدەری چاکن لەو بوارەدا .
جـ بەی بردن بەو هەموو وردەکاری و ڕێک وپێکییەی کە لە دروســت کردنی جەستەو ئەندام و کۆئەندام و دەزگا سەرسوورهێنەرەکانی دا ڕەچاوکراوە ، کە زانیاری پزیشکی و توێکاری هەندێک ڕازو نهێنی گرنگیان لەوبارەوە خستۆتەڕوو .
دـ شارەزایی پەیداکردن دەربارەی ( عەقڵ ) و کارو چالاکی پەنهان و بەرهەستەکانی .

تێبینی یەکی گرنگ :
مادام ( خۆناسین ) گرنگترین و چاکترین ڕێگای خواناسین بێ و ، وەک پێشتریش باسمان کرد لە ئەنجامی ( خواناسین ) یش ( خـۆ ) ی ڕاستەقینەمان بناسین ، کەواتە دەتوانین بڵێین : لەنێـــوان خۆناسین و خواناسین دا پەیوەندی و کارتێکردنی دووسەرە هەیەو ، هەتا چاکتر خوابناسین خۆناستر دەبین و هەتا خۆناستریش بیــن خواناستر دەبین !

٢ـ ناسینی دەوروبەرو بوونەوەر ( أفلاینظرون إلی الأبل .. إلی السماء إلی الجبال .. إلی الأرض .. ) :

دووەمین ڕێگای گرنگ و نزیکی خواناسین ناسین و پەی پێبردنی هەرچی زیاتری ئەو دیاردەو دیمەنە سروشتییە دڵ بزوێن و سەرنج ڕاکێشە یاسادارانەن کە لە دەوروبەری نیزیک و دوور ( واتە زەوی و ئاسمان ) دا دەبینرێن ، یان هەست بە شوێنەوارەکانیان دەکەین ، بەڵێ لەڕاستیدا لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە لە دیاردە سروشتییەکانی دەوروبەرو بوونەوەر هەر لە گەردیلە وردیلەکانەوە بگرە هەتا کەهکەشانە زلەکان ، کە هەرکامێکیان ئەوپەڕی وردەکاری و یاساداری یان تێدا دەدرەوشێتەوە ، ڕێگایەکی یەکجار تەخت و هەموارە بۆ پەی پێ بردن و ناسینی سیفەتە بەرزو بێسنوورە ـ کانی خوای پەروەردگار .

٣ـ کتێبی خوێنراوە ( قورئان ) ی خوا ( أفلایتدبرون القرآن .. ) :

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! ئەگەر بوونەوەرو سروشت ( الکون والطبیعة ) کتێبی بینراو ( الکتاب المنظور ) ی خودان قورئانیش کتێبی خوێنراوە ( الکتاب المقرؤ ) یەتی ، هەربۆیەش خوای زاناو کاربەجێ هەروەک چۆن دیاردەو دیمەنە سروشتییەکانی وەک : ئاسمان و زەوی و شاخ و (با )و باران و گیانداران و ڕووەک و هەورە برووسکەو .. هتد ی ناو ناون ( آیات ) ڕستەکانی قورئانیشی هەر بەم ناوە ناسکردوون ، چونکە هەروەک چۆن دروستکراوەکانی خوا کە کردەوەیینی نیشانەو بەڵگەی بوون و ناسینی سیفەتە بەرزو بێ سنوورەکانێتی ، قسەو فەرموودەکانیشی بەهەمان شێوە .

٤ـ سەرنجدانی مێژوو و شوێنەوارەکانی ( قل سیروا فی الأرض ثم انظروا کیف کان عاقبة المکذبین ) :

مێژوو و شوێنەوارەکانیشی یەکێ دیکەیە لەو ڕێیانەی کە ئینسان

دەتوانێ لێیانەوە سەرنجی پەرێزو شوێنەواری ئەو یاساو دەستوورانە بدات‌کە بۆ بەڕێوەچوون و ئاراستەکردنی ژیانی مرۆڤ‌لەسەر زەوی داینراون ، ئەو سەرنجدانەش‌دەگونجێ لە دوو ڕێ یانەوە ئەنجــــام بدرێ ، یەکەم : ئوورینان خوێندن کە بەسەرهاتی مرۆڤایەتی بەچەنــد جۆرو شێوە دەگێڕێتەوە ، دووەم : گەڕان و سووڕان بــــەزەوی داو وردبوونەوەو پەندوەرگرتن لە دیتنی ئەو دیمەن و شوێنەوارانــــەی کە گەل و کۆمەڵە پێشووەکانمان بەجێیان هێشتوون .

دووەم : ئیمان و بەندایەتی :

بەڵێ دوای ئەوەی مرۆڤی ژیر قۆناغی یەکەمی ( خواناســـــن و خۆناسین ) ی بڕی و ، زانی که دنیا شاری بێ خاوەن نیەو ، ژیــــان وەک‌بیردۆزە ماددی یە مرۆڤزادەکان گومان دەبەن پووچو بێ حیکمەت نیە ، وەک‌خوای بەدیهێنەرو کاربەجێ فەرموویەتی :( وما خلقنـــا السماء والأرض وما بینهما باطلاً ، ذلک ظن الذین کفروا ..) ص /٢٧. واتە : وە ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بەخۆڕایی دروست نەکردوون ، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێ بڕوان ..

وە دوای ئەوەی بەهۆی خواناسی‌و پەیوەندی پێوە بەستنی بـــەوە لە هیدایەت‌و ئاراستەی خوا بەهرەمەند بوو و لە ئەوەزەنگــــــی گومان و بیردۆزە پووچە مرۆڤکردەکان ڕزگاری بوو و ، بۆی دەرکەوت کە وەک‌داروین و فرۆیدو مارکس‌و فۆیرباخ‌و دورکایم گومـــــان دەبەن بەڕەچەڵەک‌ناچێتەوە سەر ئەوزەو کرم‌و قرژاڵ و بۆق و .... بەکورتی مەیموون زادە نیەو ( ئادەمزاد ) ەو ژیانی لە دابـــــن کردنی پێداویستیەکانی گەدەو گیرفان و داوێن دا کورت‌هەڵنەهاتوەو بەکوردی ( ئینسان ) ەو ئاژەڵ و دڕندەو دەعبا نیە !! بەڵـــــێ دوای ئەوە لە بیابانی گەرم‌و ئالۆزی خۆپەرستی‌و بێ خوایـــــی و

له هه‌ڵه‌ت و هه‌ڵدێری بێ ئامانجیو هه‌ڵوه‌دایی قوتاری ده‌بێ و ده‌چێته سه‌ر ئاوی سازگارو زوڵاڵی ئیمان و ده‌که‌وێته سه‌ر راسته شه‌قامی به‌ئامانج گه‌یه‌نه‌ری به‌ندایه‌تیکردن بۆ خوای ئاسمان و زه‌وی !

وه له‌راستیدا هه‌رکه‌سێک به‌چاکی خوابناسێو بزانێ چ زاتێکه‌و خاوه‌نی چ ناوی به‌رز به‌رزو چ ( صفات ) ێکه ، یه‌کسه‌ر بێ سێو دوو به‌ئه‌ندازه‌ی قووڵیو راستیی ناسینه‌که‌ی ده‌یپه‌رستێو رێگای به‌ندایه‌تی ( عبودیة ) ی به‌ره‌ولا ده‌گرێ .

به‌ڵام لێره‌دا نابێ له دوو مه‌سه‌له‌ی گرنگ بێ ئاگا بین :

یه‌ک : خواناسیو بڕوابه‌خوابوون ( ئیمان ) لێکجیان ، چونکه خواناسیی به‌س بریتیه له په‌ی پێ بردنی بوونی خواو سیفه‌ته به‌رزو په‌سنده‌کانی، به‌ڵام بڕوابه‌خوابوون ( ئیمان ) بریتیه له‌وه که ئه‌و خواناسینه ببێته ( حالّ ) و هه‌ڵوێستله زبان و هه‌ڵس و که‌وته‌کانی مرۆڤدا ره‌نگبداته‌وه ، که‌واته هه‌موو بڕواداریک خواناسه ، به‌ڵام مه‌رج نیه هه‌موو خواناسێکبه بڕوادار له‌قه‌ڵه‌م بدرێ ، هه‌ربۆیه‌ش ئیسلام ( ئیمان ) ی کردۆته مه‌رجي به‌مسوڵمان له‌قه‌ڵه‌مدران و چوونه به‌هه‌شت نه‌کخواناسیپرووت !!

دوو : ئینسان له‌رێ ی عه‌قلّ و زانسته‌وه به‌س ده‌توانێ په‌ی به بوونی خوایه‌کبه‌رێ و بزانێ که به‌دیهێنه‌رو په‌روه‌ردگارێک هه‌یه ، به‌ڵام له‌رێگای ( وه‌حی ) یه‌وه نه‌بێ ناتوانێ وه‌کپێویستپه‌ی به مه‌سه‌له - کانی دیکه‌ی خواناسی به‌رێ ، هه‌ربۆیه‌شه که ده‌بینین ئه‌و زاناو فه‌یله‌سوفه خواناسانه‌ی له تیشکی وه‌حیو هیدایه‌تی خوا بێ به‌ش بوو ون هه‌رچه‌نده زانیویانه ( خوا ) یه‌ک هه‌یه به‌ڵام گه‌لێک تووشی بیروبۆچوونی هه‌ڵه‌و سه‌یر بوون ده‌رباره‌ی (خوا ) جل جلاله . له‌کۆتاییدا ده‌ڵێم :

پێویسته بزانرێ که تاقه به‌رنامه‌و رێبازو سه‌رچاوه‌ی روون و

بێ چەندو چوونی ئیمان و بەندایەتی بەس قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە صلی اللە علیە وسلم ، ئنجا ئەو شەرحو لێکدانەوەیەی کە لەسەریشیان کراوە بەئەندازەی نیزیکی لەم دوو سەرچاوە روون و پێوەرو تەرازووە بێ چەندو چوونەوە رێزی لێ دەگیرێو وەردەگیرێ، هەزاران رەحمەتیش لە گیانی بەرزو پاکی ئەو زاناو پێشەوایانەمان بێ کە لەو رێ یەدا خزمەتیان کردوەو رێ ی دووریان بۆ وەنیزیک خستووین و، گەلێک شتی بەزەحمەت و ئالۆزیان بۆ سووک و ئاسان کردووین .

سێ یەم : یەکگرتن و برایەتی :

یەکگرتن و برایەتی ئەنجامو بەرهەمی سروشتیی و راستەوخۆی ئیمان و بەندایەتییە ، چونکە ئیمان هەموو ئەو دڵانەی کە تێیدا یەکیان گرتۆتەوەو کۆبوونەتەوە ، وەک دەزوویەکی ئاوریشمیی نەرم و مەحکەم پێکیانەوە دەبەستێو نێوانیان لەگەڵ یەک خۆش دەکات و بەیەکیانەوە جۆش دەدات ، هەربۆیەش خوای بەبەزەییو میهرەبانمان فەرموویەتی :( فاتقوا اللە وأصلحوا ذات بینکم ..) الأنفال /١ .
واتە : پارێز لەخوا بکەن و نێوانتان چاک بکەن .. !

دیارە یەکگرتن و برایەتیو دڵ پێکەوە بەستران و پێکەوە جۆشدرانی بڕوادارانێکیش کە لە قاڵبو بۆتەی ئیمان و بەندایەتیدا دارێژراون ، شتێکی سروشتیو ئاسان و چاوەڕوان کراوە هەروەک چۆن ریزبوون و پێکەوە گونجانی ئەو خشتو بلۆکانەی کە بەیەک شێوەو ئەبارە دروست دەکرێن ئاسان و بێ دەردی سەرە .

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە هەر جۆرە ناتەواوی و کەموکووڕی یەک لە یەکیەتیو برایەتی مسوڵمانان دا بێتە بەرچاو، پێویستە بۆ

هۆیەکەی چاو بە ئیمان و خواپەرستی ئەو موسڵمانانەدا بگێڕینەوە، چونکە مەحاڵە ئیمان و بەندایەتی بڕواداران تێروتەواوو دامەزراوبێو یەکیەتیو برایەتییەکەشیان لەرزۆک و نەچەسپاو .

کە دەشبینین بەدرێژایی مێژووی ئیسلام هیچکەس و هیچ کۆمەڵێک هێندەی برادەرە دڵسۆزو فیداکارەکانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام ـ خوا لێیان رازی بێ ـ پێکەوە براو تەباو دڵ پڕ خۆشەویستیو صەفا نەبووە ، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پلە ئیمانیو خواپەرستییە بەرزو کەم وێنەیەی کە ئەو هاوەڵە بەرزو بەڕێزانەی پێغەمبەرمان بە لوتف و بەزەیی خواو لەژێر تێنکی ئاراستەکردن و پەروەردەی بێ وێنەی ئەو سەروەرە بەڕێزەدا پێی گەیشتبوون .

چوارەم : خۆگۆڕین و واقیع گۆڕان :

ئەم قۆناغە کە قۆناغی کۆتایی سەفەری بەرەوخواچوون و سەرفرازی و رزگاربوونی کۆمەڵگای بڕواداروو موسڵمانە ، بەرهەمو ئەنجامی قۆناغەکانی پێش خۆیەتی ، چونکە هەرکاتێک تینکی زێڕینی خوناسیو یەکتاپەرستی لەدڵ و مێشکی گەل و کۆمەڵێکی دا ، لە گومڕاییو سەرگەردانییەوە بەرەو هیدایەت و بەندایەتییان دێنێو، لە زەلکاوی دووبەرەکیو پەرتەوازەییو تاقم تاقمێتە رزگاریان دەکاو دەریان دێنێو، بەرەو هەوارو مەنزڵی بەرزی یەکیەتی و تەبایو برایەتییان دێنێ ، گەل و کۆمەڵگایەکیش بە لوتف و هیدایەتی خوا گۆڕانێکی ئاوا بەسەرخۆی دا بێنێ ، زۆر بەئاسانی دەشتوانێ واقیعی نەخۆش و پەرێشان و بێ سەرەوبەرەی خۆی لەهەموو بوارەکانی سیاسیو ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بگۆڕێ و، نەمامی دادگەری و ئازادی و رەوشت بەرزی تێدا بنێژێ و، تۆوی بەختەوەری

ڕاستەقینەی ماددی و مەعنەوی هەردوو جیهانی تێدا بچێنێ .

کۆتایی ئەم بەشەش بەم دوو ئایەتە بەرزە دێنین :

١- ( وعد الله الذين آمنوا - منكم - وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض كما استخلف الذين من قبلهم وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم وليبدلنهم من بعد خوفهم أمناً يعبدونني لايشركون بي شيئاً .. ) النور / ٥٥ . واتە :

خوا بەڵێنی بەوانەتان داوە کە بڕوادارن و کردەوەی چاک دەکەن ، کە لە زەوی دا بیانکاتە جێ نشین هەروەک چۆن ئەوانەی پێش وانی کردنە جێنشین ، وە کە ئەو بەرنامەیەی بۆ پەسند کردوون بۆیان بچەسپێنێ ، وە بێگومان حاڵەتی ترس و لەرزیان بۆ دەگۆڕێ بە هێمنی و ئاسایش ، - بەمەرجێک - بمپەرستن و هاوبەشم بۆ دانەنێن ...

٢- ( .. إن الله لايغير مابقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم .. ) الرعد/١١.

واتە :

بێگومان خوا واقیعی هیچ گەلێک ناگۆڕێ - چ لە خراپەوە بۆ چاک و چ بەپێچەوانەوە - هەتا حاڵەتی دەروونی خۆیان نەگۆڕن ...

بەڵێ گۆڕانی ژیان و گوزەرانمان ئەنجامی گۆڕینی کردەوەو ڕەفتارەکانمانە ، هەروەک چۆن گۆڕانی وانیش بەرهەمی گۆڕینی بیروبۆچوونەکانمان و دامەزرانی ئیمانە .

# بەشی هەشتەم

## سەرەنجامی مسوگەرلە هەردووجیهان دا

خوێنەری بەڕێز !

ئەم بەشە کە بەشی کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیە تەرخان کراوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە هەرکەس و هەر گەل و کۆمەڵێک بەڕاستی ڕێبازی ئیمان بگرێ و بەپێی ڕێڕوونی و ئاراستەی خوای میهرەبان و دادگەر بەرەو ڕەزامەندی خوا ڕێگای ژیانێکی پاک و بەرزی ئینسانانە دابگرێ ، سەرەنجام ( عاقبة ) ی ئەم ژیانەو ئەو دنیاشی مسۆگەرە ، ئەو بەڵگانەشکە ڕاستیی ئەم قسەیەیان پێ دەسەلمێنین ئەمانەن :

١- عەقڵی ساغ و تەواو

٢- زانیاری ڕاست و سەلمێنراو

٣- فیطرەتی پاک و نەگۆڕاو

٤- مێژووی کۆن و نوێ

٥- گفت و بەڵێنی خوای پەروەردگار

٦- مزگێنی و شایەدی دانی تێکڕای پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام .

٧- پشتیوانی خەڵکی موسڵمانی جیهان

جارێ سەبارەت بە یەکەم و دووەم و سێیەم و چوارەم لە بەشی ئەشەمدا لەبارەی هەرکامێکیانەوە هەندێکدواوین و بەپێویستی نازانم لەم لێکۆڵینەوە کورتەدا چیدی یان لەسەر بڕۆین ، بەس ئەم دوو تێبینییە دەربارەی زانست و فیطرەتدەخەمەڕوو :

یەکەم : وەک پێشتر باسمان کرد هەتا زیاتر زانیاری گەشەو بکاو پەی بە ڕازو نهێنییە زۆرەکانی سروشت و بوونەوەر بەرێ ، چاکترو زیاتر حیکمەت و زانیاری و توانا و دەسەڵاتی بەدیهێنەرو پەروەردگاری بەرزو مەزن دەردەکەوێ ، ئنجا هەتا زیاترو چاکتر ئەو سیفەتانەو باقی سیفەتە پەسندو بێ سنوورەکانی خوا بناسین زیاتر تێروتەواوی و بێ هەڵەو پەڵەیی بەرنامەکەیمان بۆ دەردەکەوێ ، کەواتە دەتوانین بڵێین : زانیاری بەژمارەی هەموو ئەو کەهکەشان و ئەستێرەو خرۆکەو رووەک و گیانداررو دڵۆپە باران و دەنکە لمو شانەو خانەو .. بگرە بەئەندازەی هەموو گەردو گەردیلەکانی نێو بوونەوەر بەڵگەو شایەدی پەیداکردوون بۆ شایەدی دان و سەلماندنی ڕاستیی و تەواوی ئەو ئایین و بەرنامەیەی کە بەدیهێنەرو پەروەردگاری بوونەوەر ناردوویەتی ، چونکە ئەو ئایین و بەرنامەیە هەر لەو سەرچاوە زانستە بێ سنوورەی خواوە سەرچاوەی گرتوە کە ئەو هەموو یاساو وردەکاری و ڕێک وپێکییەی بوونەوەری لێوە هاتوە !!

دووەم : هەتا هەڵس وکەوت و ڕەفتارەکانی مرۆڤ بەتاک و کۆمەڵەوە زیاتر پێچەوانەی شەرع و بەرنامەی خوا بن ، فیطرەتی ئینسان زیاتر دەنگی ناڕەزایی لێ بەرزدەبێتەوەو ئیشارەتی سوور پیشان دەدات ، بۆ وێنە :

أ ـ لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان دا کە بێ خوایی و ڕەوشت نزمیی و بێ بەندو باری و بەرەڵڵایی گەیشتۆتە ئەوپەڕی ، گەلێک نەخۆشی عەقڵیی و کۆمەڵایەتیی و دەروونیی و جەستەیی وایان دەنێودا بڵاوبوونەوەو تەشەنەیان کردوە کە پێشتر یان هەر نەبوون یان زۆر کەم بوون ، بەتایبەتی نەخۆشی ( ئایدز ) کە لەم ساڵانەی دواییدا سەری هەڵداوەو پزیشکەکان دەڵێن میکرۆبەکەی بەهۆی زینا و نێربازی و ..

هتدەوە پەیدا دەبێ، ئێستا ئەم نەخۆشییە هەڕەشە لە ژیانی زۆربەی خەڵکی ئەوروپاو ئەمریکا دەکات و بۆیان بۆتە مەترسی - یەکی جیددی ! بگرە بۆ هەموو داوێن پیس و بێ نامووسانی نێرومێی جیهان مەسەلەیەکی ترسناکە !!

ب- دەوڵەتە کۆمۆنیزمییەکانی ڕۆژهەڵات کە بناغەکەیان لەسەر ( ماددە پەرستی و دژایەتی خوا ) لەلایەک و ( دیکتاتۆریەت و کپ کردنی هەست و داخوازی بە سروشتییەکانی مرۆڤ ) لەلایەکی دیکەوە بنیات نرابوو، بە جرەجر توانیان شەست حەفتا ساڵێک دەوام بکەن و سەرەنجام فیطرەتی ئینسان بوو بە بوومەلەرزەو بورکانێک و لەبەریەکی هەڵوەشاندن !

بەڵێ فیطرەتی ئینسان و ڕەوتی ژیان سەلماندیان کە دنیا شاری بێ خاوەن نیەو ناگونجێ کۆمەڵگای مرۆڤ لەسەر بنچینەی دژایەتی خوا کردن دابمەزرێ و بشتوانێ درێژە بە بوونی خۆی بدات . وە سەلماندیان کە هەرکام لە هەست و نەستەکانی ( خواپەرستی و دینداری ) و ( خۆشویستنی گەل و نیشتمان ) و ( مەیلی شت هەبوون ) و ( حەزکردن بە ئازادی و دەربڕینی بیروڕا ) ... هتد چەند هەست و نەست و داخوازی یەکی ڕەسەنی سروشتی ئینسانن و هەر ڕژێم و دام و دەزگایەک هەر پشتگوێیان بخات ، چ جای دژایەتییان بکات شۆڕشی لێ دەکەن و لێی هەڵدەگەڕێنەوەو تەفرو توونای دەکەن و ( ڕووسیا )ی دەکەن !!

جا لەڕاستیدا ئەمانە هەموو شایەدی دان و پشتگیری کردنی فیطرەتی ئینسانن لەڕاستی و تەواوی ئەو بەرنامەو ئایینە تێرو تەواوەی خوا کە پتر لە ( ١٤ ) سەدە بەر لە ئێستا بەبێ دەردی سەرو داواکاری هیچ کەس دانی بەبوونی هەموو ئەم داخوازییە سروشتییانەی مرۆڤ و غەیری وانیش دا هێناوە، ڕێگاو چۆنیەتی تێرکردنیشیانی دیاری کردوە .

ئێستا ش دێینەسەر ڕوونکردنەوەیەکی کورت دەربارەی هەرکام لە سێ بەڵگەکانی تر : .

٥ ـ گفت و بەڵێنی خوای پەروەردگار :

خوای کاربەجێ لە چەندان ئایەت دا گفت و بەڵێنی بەبڕواداران و پەیڕەوانی بەرنامەکەی داوە کە پشتیوانیانەو لە دنیا و دوا ڕۆژدا بەچاوی لوتف و بەزەیی خۆی چاودێری یان دەکات و بەهێزو دەسەڵاتی بێ سنووری خۆی لەگەڵیانەو هەمیشە سەرکەوتن و بەرزی لەگرەوی ئەوان دایە بۆ نموونە :

( وأَنتم الأعلون إن كنتم مؤمنين ) آل عمران / ١٣٩ .

وە فەرموویەتی :( إنا لَنَنْصُرُ رُسُلَنا والذين آمنوا في الحياة الدنيا ويوم يقوم الأشهاد .. ) غافر /٥١ .

وە فەرموویەتی :( أَلا إن حزب الله هم المفلحون ) المجادلة /٢٢.

هەروەها فەرموویەتی :( وَعَدَ اللهُ الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الأرض .. ) النور / ٥٥ . ... الخ .

دیارە هەرکەسێکیش بەعاستەم گومان و دوودڵی لە گفت و بەڵێنەکانی خوادا هەبێ پێویستە چاو بە ئیمان و خواناسییەکەی دا بگێڕێتەوە ، چونکە خوا ـ سبحانه وتعالى ـ پاک و بێگەردە لە هەموو کەموکووڕی یەک و پەیمان شکاندن لەوی ناوەشێتەوە ( ..ولَنْ يُخلِفَ الله وعده .. ) الحج / ٤٧ .

وە هیچ شتێکیشی لەبەر ماسێ نابێو توانای بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێ :( وكان الله على كل شيء مقتدراً ) الكهف / ٤٥ .

٦ ـ مزگێنیو شایەدی دانی تێکڕای پێغەمبەران :

بەڵێ خوێنەری بەڕێز !

نەوە کە هەرکەسێک بکەوێتە سەر ڕاستەشەقامی بەرنامەو هیدایەتی

خوا دەبێتە خاوەنی سەرەنجامی چاکی دنیاو دوارۆژان حەقیقەتێکە هەموو پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا علیهم الصلاة والسلام کە لە کتێبی ( مسند ) ی ( إمام أحمد بن حنبل ) دا لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە ژمارەیان ( ١٢٤٠٠٠ ) بووە مژدەو مزگێنی یان پێداوەو بەزمانی وتاروکردار شایەدی یان لەسەر داوە ، ئنجا بەراستی سەیرە دەعوایەکسەدو بیست و چوار هەزار شایەد لە ڕاستترین و چاکترین و گەورەترین و متمانەپێکراوترین خەڵکی شایەدی لەسەر بدەن ، کەچی جێی دردۆنگی و گومانی هەندێک کەس بێ !!

٧- پشتیوانی خەڵکی موسڵمانی جیهان :

بەڵێ ئەمیش یەکی دیکەیە لەو بەڵگانەی کە سەرکەوتن و بەمراد گەیشتنی قۆناغی ژیانی دنیای ئەو گەل و کۆمەڵە کە ئاینی خوا دەکاتە ڕێباز ئیسپات دەکەن .

چونکە ئەمڕۆ سەرجەمی موسڵمانان بە زیاتر لە ملیارێک دادەنرێن و هەر گەلێکیش ملیارێک کەس دۆست و پشتیوانی بێ سەرکەوتن و بەئامانج گەیشتنی مسۆگەرە .

وە لەراستیدا گەلی موسڵمانی کورد هەتا ئێستا - وەک پێویست - هەوڵی نەداوە سوود لەو پاڵپشت ( سَنَد ) و پشتیوانە بەهێزە وەربگرێ ، بەڵکو بەپێچەوانەوە گەلێک جار دەمراست و سەرکردە - کانی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کورد ڕەفتار و هەڵوێستی وایان نواندوە کە ببێتە هۆی بێزاندن و دزێوکردنی گەلی کورد لەبەرچاوی جیهانی ئیسلامی ![1] دیارە ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە

---

(١) لە کورێکدا کە لە یەکێک لە وڵاتە ئیسلامییەکان دا بەسترابوو و منیش بەشدار بووم ، لەکاتێکدا نۆرەی قسان گەیشتە من و باش

هەڵەو تاوانە پێشووەکان و پێویستە پەندی لێ وەربگیرێ و دووبارەو
چەند بارە نەکرێتەوە !

هەڵبەتە سەرکەوتنی ( موسڵمانانی ئەفغانستان ) یش بەسەر سوپای سووری داگیرکەرو پیلان و فێڵەکانی ئیمپریالیزمی جیهانیدا بەهۆی یارمەتی دان و پشتیوانی لێ کردنی ماددی و مەعنەوی موسڵمانانی جیهان ، نموونەیەکی هەرە زەقی لەسەرکردنەوەو پشتیوانی لێ کردنی موسڵمانانی دنیایە لەو گەلەی کە هەویەی ئیسلامی خۆی دەپارێزێ و بە شوێن پێی پێغەمبەرەکەی داو لەبەر تیشکی هیدایەتی خوادا بەرەو مەبەست هەنگاو دەنێ .

کۆتایی ئەم بەشەش بەم ئایەتە دێنم :

( إن هذه أمتكم أمةً واحدةً وأنا ربكم فاعبدون ) الأنبياء / ٩٢ .

---

..............................................

باس و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر دەربارەی گەلی کوردو ئەو بارودۆخە ناهەموارەی تێیدا دەژی هاتمە سەر گلەییو گازندە لەو جەماوەرو کۆمەڵ و ڕێکخراوە موسڵمان و ئیسلامییانەی جیهانی ئیسلامی کە بۆچی هیچ بەرگری و لەسەرکردنەوەیەکیان دیار نیە لەسەر کێشەی ڕەوای گەلی کورد کە بەشێکە لە ئوممەتی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام وە چاکەیەکی زۆری بەسەر جیهانی ئیسلامییەوە هەیە ؟! دڵنیشتوانی کۆڕەکە گوتیان ئەم قسانەت لێ دەسەلمێنین و دان بە کەمتەرخەمیو ساردو سڕی خۆمان دا دێنین ، بەلام ئایا بۆخۆشتان حەقی گلەییو گازندە نین کە ( ئیسلام ) تان نەکردۆتە بەرنامەو دروشمی خەباتتان و بەردەوام پەنا دەبەنە بەر ئەو بیردۆزە ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوایی ـ یانەی کە دژی ئاینەکەتانن و جگە لە پەرتەوازەکردن و ناو زڕاندن و گومانی بەد دروستکردن لە دڵی گەلانی ئیسلامییشدا هیچ سوودێکیان پێ نەگەیاندوون ؟!

دیارە ( لەقاقار هەتێدا ئاو ڕادەوەستێ ) . بۆیە منیش جگە لە دان پێداهێنانی ئەو حەقیقەتە تاڵە چارەیەکم نەبوو !

# دواقسەم

. خوێنەری بەڕێز !
دوا قسەی خۆمت لە سێ خاڵی کورتدا ئاراستە دەکەم :

یەکەم : مادام خۆمان - وەک گەلی کورد - بەموسڵمان بزانین بۆمان نیە وەک ڕژێمی دیموکراسی دەڵێ : لە سفرەوە دەست پێ بکەین بۆ دروستکردنی ئەنجومەن و هەر شتێکی دیکەش کە پێمان وابێ گەلەکەمان پێویستیەتی ، چونکە ئێمە ناوو نیشان و بەرنامەی تێروتەواوو پەسندکراوی خوامان هەیەو ، پێویستە لە هەنگاوی یەکەمی دەستبەکاربوونمانەوە ئەوە لەبەرچاو بگرین کە خوایەکی میهرەبان و دادگەرو پێغەمبەرێکی پێشەواو سەروەرمان هەیەو ، خاوەنی ئایین و بەرنامەیەکی تێروتەواوو دەستکاری نەکراوین و هەتا خۆمان بە بەندەی خواو ئۆممەتی پێغەمبەری پێشەواو شوێنکەوتووی ئیسلامو ئەهلی قیبلە بزانین ، دەبێ هەموو هەڵوێست و بڕیارێکمان لە ئایین و بەیڕەوی خواوە هەڵبقوڵێو مۆری ( شەرع )ی خوای پێوەبێ .

دووەم : بەبێ خۆگۆڕین و خۆچاککردن بەگوێرەی بیروباوەڕو بەرنامە ( العقيدة والشريعة ) ی ئیسلام گۆڕان و چاکبوونی ئەم واقیعو بارودۆخە مەحاڵ و چاوەڕوان نەکراوە ، چونکە واقیعی ژیانی هەر گەل و کۆمەڵێک ڕەنگدانەوەی جۆرو چۆنیەتی بیروبۆچوون و هەڵسوکەوتە زاتیو دەروونییەکانیانە ، کەواتە با زیادەڕۆیی لە پێدا هەڵگوتنی ئەنجومەندا نەکەین و ( پەرلەمان ) لە خەڵکی یادەو عەوام نەکەینە ( حەوتدەرمانە ) و ( دەرمانی یەکسابە ).

جونکە دوایی دووچاری پەشێمانیو عوزرهێنانەوە دەبین !(1)

سێ یەم : هەرچەندە هەموو کاتێک ڕەزامەندی خواو شادبوون بە زیانی ڕازاوەو نەبڕاوەی بەهەشتلە میانە ( خلال ) ی زیانێکی ئینسانانەی پاک و ڕاستدا وەدەستدێ،کەبەهۆی جێبەجێ کردنی یاساو دەستوورەکانی بەرنامەی خواوە دەرەخسێ . بەلام پێویستە ئاگاداری ئەوەشبین کە ئێمە ـ وەکگەلێکی مسولمان ـ ئامانجی هەرە بەرزمان ڕازی کردنی خوایە بەهۆی ئەنجامدانی ئەرکی هەرشانمان کە بەندایەتیەو بەندایەتیشحیکمەتی خولقێنرانمانە ( وماخلقتُ الجنّ والأنسَ إلاّ ليعبدون ) الذاريات / ٥٦ .

ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە ئێمە زیانی دنیا بەشوێنی بەندایەتی تێداکردن و تاقیکرانەوەمان دەزانین نەکدڵ بەستن و نیشتەجێ بوون ( .. وان الدار الآخرة لهي الحيوان لوكانوا يعلمون ) .

وآخر دعوانا أنِ الحمد لله رب العالمين

٥ ذوالقعدة ١٤١٢

٧ آیار ١٩٩٢

---

(١) لێرەدا وەکدڵسۆزێکبەناوی جەماوەری کوردەوە قسە دەکەم ، دەنا هەڵوێستمان دەربارەی پەرلەمان ڕوون و ئاشکرایە ، واتە ( پەرلەمان ) یێکە لەسەر بنچینەی دیموکراسی بنیات دەنرێ .

# ناوەڕۆک

تێبینی:
١) برایەڵ مەسروق چاپ کردنی ئەم کتێبەی گرتوتە ئەستۆی خۆی خوا جەزای خێری بداتەوە.

٢) لەبەر نەبوون و گرانی کەل و پەلی چاپ کردن ئەم کتێبە پارەیەکی زۆری تێچووە بۆیە نرخی تۆزێ گرانە.

## ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی فیکری و سیاسی یە دەربارەی چۆنیەتی چارەسەری کێشەی کوردو گۆڕین و چاککردنی ئەو واقیعە سەخت و دژوارەی کەلەم رۆژگارەدا گیرۆدەی بووە، وە هەڵسەنگاندنێکە بۆ ئەو رێچکەو بیردۆزە مرۆڤکردانەی کە گەلی کورد لە درێژەی خەباتی رەوای رزگاریخوازانەی دا پەنای بردۆتە بەریان بەتایبەتی دیموکراسی.

وە روونکراوەتەوەو سەلمێنراوە کە تاقە بەرنامەی تێروتەواوو تاقە رێبازی رزگاری و سەرفرازی (کورد)و هەر گەل و کۆمەڵێکی دیکەش تەنها ئیسلامەو لەو رێیەشەوە نەبێ گەلەکەمان نەک هەر بەمرادو مەبەست ناگات بگرە زۆریش لەسەر خەبات و رەنجدانەکەی قەرزدار دەبێتەوەو بنەتووەکەشمان دەست ناکەوێتەوە! مێژووی رابردووشمان چاکترین بەڵگەو شایەدە.